



# پـــوختەیەکی بـەســوود

## لەسەر ژیاننامەی پێغەمبەری خودا ﷺ

## ڕەوشت و ئاکارەکانی


نووسینی: دکتۆر هەیسەم سەرحان

وەرگێڕانی: عبدالمجید عبدالحمید - کفری



2023




# پوختەیەکی بە سوود لەسەر

## ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و

## ڕەوشت و ئاکارەکانی


**بە پێنوسی: هیثم بن محمد سرحان**

مامۆستا لە پەیمانگای حەرەم لە مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ)– لە پێشاندا–

وە سەرپەرشتیاری ماڵپەڕی ( التأصيل العلمي)



خوای گەورە لە خۆی و باوك و دایک و هەموو ئەو کەسانە

خۆش بێت کە هاوکاری بوون لە بە چاپگەیاندنی ئەم کتێبەدا








إنَّ الحَمدَ لله نَحمَدُه و نستعينهُ ونَستغفرُه ، ونَعوذُ بالله من شُرور أنفسِنا ومن سيِّئاتِ أعمالنا مَن يَهدِهِ الله فلا مُضلَّ له ، ومَن يُضلل فلا هادِيَ له ، وأشهَد أنْ لا إله إلا الله وحدَه لا شَريك له ، وأشهَد أنَّ محمَّدا عبدُه ورسولُه (ﷺ) ،

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ (آل عمران )،﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ (النساء)، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب)

أما بعد :

ئەمە چەند باسێكی كەمە بێ نیاز نییە لێی هەركەسێك كەمترین هیممەتی هەبێت بۆ ناسینی پێغەمبەرەكەی (ﷺ) و ژیاننامە و رێبازەكەی،



(ئیبنو لقەییم) –رەحمەتی خوای لێ بێت – دەفەرموێت : (ئەگەر هاتوو بەختەوەری بەندەکان پەیوەست بێت بە ڕێبازەکەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، ئەوا پێویستە لەسەر هەموو کەسێك ئامۆژگاری خۆی دەوێت و دەرباز بوون و بەختەوەری دەوێت، ئەوا هێندە لە ڕێباز و ژیاننامە و کاروبارەکەی بزانێت لەو کەسانە دەری بکات کە ناشارەزان بەو پێغەمبەرە (ﷺ)، وە ببێتە یەکێك لە شوێنکەوتوان و جەماعەت و حیزبەکەی، وە خەڵکیش لەم باسەدا جیاوازن لە نێوان کەسانێك زۆر دەزانن و کەسانێك کەم و کەسانێك مەحرومن لێی، وە فەزڵیش بە دەستی خوایە دەیداتە هەرکەسێك ویستی لەسەر بێت و خوای گەورەش خاوەنی فەزڵێکی زۆر و مەزنە).

داوا لە خوای گەورە دەکەم خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە نسیب من و ئێوە بکات، هەروەها گوێڕایەڵی کردنی لەوەی فەرمانی پێکردووە و دوور کەوتنەوە لەوەی نەهی لێکردووە و یاساغی کردووە .

اللَّهُمَّ صلِّ عَلَى مُحَمَّد وَعَلَى آل مُحَمَّد كَمَا صليت عَلَى  إِبْرَاهِيم و على آل إِبْرَاهِيم ، وَبَارك عَلَى مُحَمَّد وَعَلَى آل مُحَمَّد كَمَا باركت عَلَى إِبْرَاهِيم و على آل إِبْرَاهِيم إِنَّك حميد مجيد، والحمد لله رب العالمين.

## نـــاو و ڕەچـەڵـەکـی (ﷺ) :

ناوی پیرۆزی (محمد) ی کوڕی (عبدالله) ی کوڕی (عبدالمطلب) ی کوڕی (هاشم) ی کوڕی (عبدمناف) ی کوڕی (قصي) ی کوڕی (كلاب) ی کوڕی (مرَّة) ی کوڕی (كعب) ی کوڕی (لؤي) ی کوڕی (غالب) ی کوڕی (فهر) ی کوڕی (مالك) ی کوڕی (النضر) ی کوڕی (كنانة) ی کوڕی (خزيمة) ی کوڕی ( مُدركة) ی کوڕی (إلياس) ی کوڕی (مُضر) ی کوڕی (نزار) ی کوڕی (معد) ی کوڕی (عدنان)، وە (عدنان) لە نەوەی (إسماعيل) ی کوڕی (ئیبراهیم) ی خەلیلە .

باشترین کەسی سەر زەوییە لە ڕەچەڵەکدا بە ڕەهایی، لە فەرموودەیەکدا هاتووە کەوا (هیرەقل) پادشای ڕۆمەکان بە ئەبو سوفیانی وت : پرسیارم لێ کردی دەربارەی ڕەچەڵەکی ؟ وتت : کەوا خاوەنی نەسەب و ڕەچەڵەکێکی بەرزە، دەی پێغەمبەرانیش ئاوان، لە باشترین ڕەچەڵەکی قەومەکەی خۆیان ڕەوانە دەکرێن )).

| | |
|---|---|
| **هەڵبژاردنی (ﷺ) :** | پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (إن الله اصطفى كنانة من ولد إسماعيل، واصطفى قريشاً من كنانة، واصطفى من قريش بني هاشم، واصطفاني من بني هاشم) واتە : خوای گەورە (کەنانە)ی لە نەوەی (ئیسماعیل) هەڵبژارد و لە (کەنانە) قورەیشی هەڵبژارد و لە قورەیشدا (بەنی هاشم)ی هەڵبژارد، وە لە (بەنی هاشم)دا منی هەڵبژارد). |

| | | |
|---|---|---|
| **ناوەکانی (ﷺ) :** | | هەموو ناوەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەصفن، هیچی تەنها ناوێکی رووت نین و تەنها مەبەست لێی ناسین بێت، بەڵکو ئەوانە چەند ناوێکن لە صیفاتەوە وەرگیراون کە مەدح و سەتایش و کەمال لە خۆ دەگرێت : لەوانە : |
| | **محمد :** | بە ناوبانگترین ناوەکانیەتی، وە لە تەوراتدا بە راشکاوی بەو ناوەوە هاتووە . وە مانای : زۆری ئەو ئاکار و صیفاتانەی کە ستایشی لەسەر دەکرێت . |
| | **أحمد :** | واتە : لە هەموو کەسێك زیاتر سوپاس و ستایشی خوا دەکات، وە ئەوانەی لە ئاسمان و زەویدان و ئەوانەی لە دونیا و دوارۆژدان سوپاس و ستایشی دەکەن لەبەر زۆری ئاکار و صیفاتە جوانەکانی، وە (مەسیح) بە ئەو ناوەوە ناوی لێ ناوە . |
| | **المتوكِّل :** | بەو ناوەوە ناو نراوە، چونکە پشتی بە خوای گەورە بەستبوو لە جێ بە جێ کردنی دینی خوادا، بە پشت بەستنێك کە هیچ کەسێکی بەشدار نەدەکرد لە گەڵیدا . |

ناوەکانی (ﷺ) :

| | |
|---|---|
| الماحي : | ئەو کەسەی کە خوای گەورە کوفری پێ دەسڕێتەوە و نایهێڵێ، وە بە هیچ کەسێك کوفر نەسڕاوەتەوەو لە ناو نەدراوە هەروەکو چۆن بە ئەو سڕایەوە . |
| الحاشر : | خەڵکی لە پاش من و بە دوای مندا حەشر دەکرێن، هەر دەڵێی ئەو ڕەوانە کراوە بۆ ئەوەی حەشری خەڵکی بکات . |
| العاقب : | ئەو پێغەمبەرەی (ﷺ) کە هیچ پێغەمبەرێك لە پاش ئەو نییە، ئەمەش وەکو دوایینە (الخاتم). |
| المُقفي : | ئەو کەسەی کە شوێن پێی ئەوانەی پێش خۆی هەڵگرتووە، خوای گەورە خستییە سەر ڕێگاو شوێن پێی ئەوانەی پێش خۆی هاتبوون لە پێغەمبەران . |
| نبي التوبةِ : | ئەو کەسەی کە خوای گەورە بە دەستی ئەو دەرگای تەوبەی لەسەر خەڵکی سەر زەوی کردەوە، جا خوای گەورە لێیان خۆش بوو و تەوبەی لێ وەرگرتن، بە شێوەیەك لە پێش ئەو بەو شێوە نەبووە، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو کەس زیاتر داوای لێخۆشبوونی دەکرد و تەوبەی دەکرد . |
| نبي الملحمةِ : | ئەو کەسەی کە بۆ جیهادی دوژمنانی خوا ڕەوانە کرا، هیچ پێغەمبەرو ئوممەتێك بەو شێوەیە جیهادیان نەکردووە هەروەکو چۆن پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئوممەتەکەی جیهادیان کردووە، وە ئەو داستانە گەورانەی کە ڕوویدا لە سەر دەستی ئەو و ئوممەتەکەی، هەرگیز لە پێش ئەو بەو شێوەیە ڕووی نەداوە . |

**ناوەکانی (ﷺ) :**

**نبيُّ الرحمة :**

ئەو کەسەی خوای گەورە وەکو ڕەحمەتێك بۆ هەموو خەڵکی ڕەوانەی کرد، خوای گەورە بە ئەو ڕەحمی بە هەموو خەڵکی سەر زەوی کرد، جا ئیمانداران زۆرترین پشکیان لەو ڕەحمەتە بەرکەوت، بەڵام بێباوەڕان، ئەوانەی کە ئەهلی کیتاب بوون لە ژێر سێبەر و پەیمان و بەڵێنەکانیدا ژیان .

**الفاتح :**

خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو دەرگای هیدایەتی کردەوە لە پاش ئەوەی داخرا بوو، وە ئەو چاوانەی کردەوە کە نابینا بوون و ئەو گوێیانەی کردەوە کە کەڕ بووبوون، وە ئەو دڵانەی کردەوە کە پەردەپۆش کرابوون، لە سەر دەستی ئەو شار و وڵاتی بێباوەڕان ئازاد کران، بە ئەو دەرگای بەهەشتەکان کرانەوە، وە بە ئەو دەرگای زانستی بەسوود و کاری چاك کرایەوە .

**الأمين :**

ئەو لە هەموو کەسێك شایستەترە بەم ناوە، جا ئەو ئەمین و دەستپاکی خوای گەورەیە لە سەر وەحی و دینەکەی، ئەو ئەمین و دەستپاکی ئەوەی لەسەر زەویدایە و ئەمین و دەستپاکی ئەوەیە لە ئاسمانەکاندایە، بەڵکو بێباوەڕانی مەککە ناویان لیّ نابوو ئەمین و دەستپاك لە پێش ئەوەی ڕەوانە بکرێت و ببێتە پێغەمبەر (ﷺ).

**البشير :**

موژدەدەری پاداشتە بۆ ئەو کەسەی گوێڕایەڵی دەکات و ترسێنەرو هەڕەشەدەری سزایە بۆ ئەو کەسەی سەرپێچی دەکات .

**ناوەکانی (ﷺ) :**

**گەورەی نەوەی ئادەم :**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا فَخْرَ)) واتە: من گەورەی نەوەی ئادەمم لە رۆژی قیامەتدا بە بێ هیچ شانازی و خۆهەڵکێشانیك)).

**السراج المنير :**

ئەوەی کە رووناکی دەبەخشێت بە بێ سووتان، بە جیاواز لە گەڵ (الوهاج) دا چونکە جۆرێك لە سووتانی تێدایە .

جا ئەو بەندەی خوایە، بەندایەتییەکی تایبەتی تایبەتی هەیە، چونکە ئەو هەموو پلەکانی بەندایەتی تەواو کردووە .

**صیفاتەکانی (ﷺ) بە گشتی :**

کاملترین و تەواوترین وەصف ئەوەیە کە خۆی وەصفی خۆی کردووە و فەرموویەتی : (أَنَا مُحَمَّدٌ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، مَا أُحِبُّ أَنْ تَرْفَعُونِي فَوْقَ مَنْزِلَتِي الَّتِي أَنْزَلَنِي اللَّهُ) واتە : من محمدم (ﷺ), بەندەی خوا و نێردراوی ئەوم، پێم خۆش نییە لەو پلەوپایەی کە خوای گەورە دایناوم بەرزترم بکەنەوە )

پێغەمبەری خوا (ﷺ) جوانترین کەس بووە لە رەوشت و خولقەتدا، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ القلم)

وە عائیشە فەرموویەتی : (كَانَ خُلُقُهُ الْقُرآنَ) واتە : بە راستی رەوشتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) قورئان بوو) .

بە قورئان کاری دەکرد و لە سەر سنوورەکانی رادەوەستا و ئەوەی ئەو پێی رازی بوایە ئەمیش پێی رازی دەبوو، وە ئەوەی ئەو پێی توورە بوایە ئەمیش پێی توورە دەبوو .

**صيفاتەكانى (ﷺ) بە گشتى :**

**خليل الله :**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : (إِنَّ اللهَ اتَّخَذَنِي خَلِيلًا كَمَا اتَّخَذَ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا) واتە : خوای گەورە منی بە خەلیلی خۆی هەڵبژاردووە، هەروەکو چۆن ئیبراهیمی بە خەلیلی خۆی هەڵبژاردووە)) (خەلیل : بەرزترین پلەی خۆشەویستییە).

**صيفاتەكانى (ﷺ) بە گشتى :**

**جەستەی شكۆدار و شەريفى :**

ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێت : (كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَزْهَرَ اللَّوْنِ» أي: أَبْيَض مُسْتَدِيرًا «كَأَنَّ عَرَقَهُ اللُّؤْلُؤُ، إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ، وَلَا مَسِسْتُ دِيبَاجَةً» وهو نوعٌ نفيسٌ من الحرير «وَلَا حَرِيرَةً أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) ، وَلَا شَمَمْتُ مِسْكَةً وَلَا عَنْبَرَةً أَطْيَبَ مِنْ رَائِحَةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)) واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەسێکی سپی مەیلەو سوورکار بوو، ئارەقەکەی هەروەکو مرواری بوو لە سپێتی و ڕوونیدا، ئەگەر ڕێی بکردایە ڕاست و چەپی دەکرد، هەرگیز دەستم نەداوە لە هیچ ئاورێشمێك (کە جۆرێکی گرانبەها و دەگمەنە لە حەریر) و هیچ حەریرێك لە دەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەرمتر بێت، وە بۆنی هیچ میسك و عەنبەرێکم نەکردووە خۆشتر بێت لە بۆنی پێغەمبەری خوا (ﷺ))).

## صیفاتەکانی (ﷺ) بە گشتی :

### بەژن و باڵای پیرۆزی :

(ئەلبەرائی کوڕی عازیب ) دەفەرموێت : (كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) مَرْبُوعًا» أي: مُتوسِّط القامة «بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، لَهُ شَعْرٌ يَبْلُغُ شَحْمَةَ أُذُنِهِ، رَأَيْتُهُ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ، لَمْ أَرَ شَيْئًا قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهُ) واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەسێکی چوار شانە بوو (واتە : بەژن و باڵای ناوەند بوو) نێوان هەردوو شانەکەی دوور لە یەکتر بوون، پرچێکی هەبوو دەگەیشتە لای نەرمەی گوێیەکانی، لە پۆشاکێکی سووردا بینیم، هەرگیز هیچ شتێکم نەبینیوە لەوە جوانتر بێت))

### روخسار و روومەتی پیرۆزی :

(کەعبی کوڕی مالیك) دەفەرموێت : ((فَلَمَّا سَلَّمْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَهُوَ يَبْرُقُ وَجْهُهُ مِنَ السُّرُورِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ إِذَا سُرَّ اسْتَنَارَ وَجْهُهُ حَتَّى كَأَنَّهُ قِطْعَةُ قَمَرٍ، وَكُنَّا نَعْرِفُ ذَلِكَ مِنْهُ»، وسُئل البراء : أكان وجه النَّبِيّ (ﷺ) مثل السَّيف؟ قال: «لَا؛ بَلْ مِثْلَ القمر)) واتە : کاتیێ کە سەلامم کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتێکدا ئەو لە خۆشیاندا رووخساری دەگەشایەوە، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر خۆشحاڵ بوایە ئەوا روخساری دەگەشایەوە تا وەکو پارچەیەکی مانگی لێ دەهات، وە ئەوەمان لێ بە دی دەکرد) وە پرسیار کرا لە (ئەلبەرائی کوڕی عازیب) : ئایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) روخساری وەکو شمشێر بوو (مەبەستی بە درێژی بوو) فەرمووی : نەخێر بەڵکو وەکو مانگ بوو )) (مەبەستی بازنەیی و خڕ بوو).

## صیفاتەكانی (ﷺ) بە گشتی :

### پرچی پیرۆزی (ﷺ) :

ئەنەسی كوڕی مالیك دەفەرمویت : «كان النبي (ﷺ) ضخم اليدين. لم أر بعده مثله ، وكان شعر النبي (ﷺ) رَجِلا، لا جَعد)) أي : لا التواء فيه ولا تقبض (( ولا سبط)) أي : ولا مسترسل)) **واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستەكانی گەورە بوون، هیچ كەسێكم لە پاش ئەو وەكو ئەو نەبینیوە، وە پرچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نە خاو بوو نە لوول))** .

### چاوی پیرۆزی :

**(جابیری كوڕی سەمورە) دەفەرمویت** : ((كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ضَلِيعَ الْفَمِ» أي: واسعه «أَشْكَلَ الْعَيْنِ» أي: فيه حمرةٌ في بياض العينين «مَنْهُوسَ الْعَقِبَيْنِ» أي: قليل لحم العقب.)) **واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەمی پیرۆزی گەورە بوو (عەرەب مەدحی دەمی گەورەیان دەكرد و زەمی دەمی بچوكیان دەكرد) وە كەمێك سوورایی لە سپێتی چاوەكانیدا هەبوو (یان : شەقی چاوەكانی درێژ بوو) و پاژنەكانی كەم گۆشت بوون))** .

### ئارەقەی پیرۆزی (ﷺ) :

**ئەنەسی كوڕی مالیك دەفەرمویت** : «دَخَلَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (ﷺ)، فَقَالَ» أي: نام نومة القيلولة «عِنْدَنَا، فَعَرِقَ وَجَاءَتْ أُمِّي بِقَارُورَةٍ، فَجَعَلَتْ تَسْلُتُ» أي: تجمع «الْعَرَقَ فِيهَا، فَاسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا أُمَّ سُلَيْمٍ؛ مَا هَذَا الَّذِي تَصْنَعِينَ؟ قَالَتْ: هَذَا عَرَقُكَ نَجْعَلُهُ فِي طِيبِنَا، وَهُوَ مِنْ أَطْيَبِ الطِّيبِ». **واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ لامان و لای ئێمە خەوت (خەوی پشووی نیوەڕۆ)، جا ئارەقەی كرد و دایكم بوتڵێكی شووشەی هێنا و ئارەقەكەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) تێدا**

## صیفاتەکانی (ﷺ) بە گشتی :

### ئارەقەی پیرۆزی (ﷺ) :

کۆدەکردەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە خەوەکەی هەستا و فەرمووی: ئەی دایکی (سولەیم) چی دەکەیت ؟ فەرمووی: ئەمە ئارەقەی تۆیە و دەیکەینە ناو بۆنە خۆشەکانی خۆماندا، ئەمەش بۆنخۆشترین بۆن خۆشەکانە)) .

### مۆری پێغەمبەرایەتی :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆری پێغەمبەرایەتی لە نێو هەردوو شانیدا بوو، ئەویش بریتی بوو لە شتێکی دیار و بارز لە جەستەیدا وەکو نیشانەیەك بوو .

جابیری کوڕی سەمورە فەرموویەتی: «وَرَأَيْتُ الْخَاتَمَ عِنْدَ كَتِفِهِ مِثْلَ بَيْضَةِ الْحَمَامَةِ، يُشْبِهُ جَسَدَهُ».واتە : مۆرەکەم بینی لە نێو شانیدا بە ئەندازەی هێلکەی کۆترێك دەبوو، شێوەی لە جەستەی دەچوو).

### هاوەڵانی (ﷺ) بە شکۆمەندییەوە تەماشایان دەکرد

عەمری کوڕی ئەلعاص دەفەرموێت : «مَا كَانَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) ، وَلَا أَجَلَّ فِي عَيْنِي مِنْهُ، وَمَا كُنْتُ أُطِيقُ أَنْ أَمْلَأَ عَيْنِي مِنْهُ إِجْلَالًا لَهُ، وَلَوْ سُئِلْتُ أَنْ أَصِفَهُ مَا أَطَقْتُ؛ لِأَنِّي لَمْ أَكُنْ أَمْلَأُ عَيْنِي مِنْهُ». واتە : هیچ کەسێك نەبوو بە ئەندازەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لام خۆشەویست بێت، وە هیچ کەسێك هێندەی ئەو شکۆمەند و بە هەیبەت نەبوو لەپێش چاوم، وە هەرگیز نەمتوانی پڕ بە چاوەکانی خۆم تەماشای بکەم لەبەر هەیبەت و شکۆمەندی و شەرمدا، وە ئەگەر پرسیارم لێ بکرێت وەصفی بکەم ئەوا ناتوانم، چونکە من پڕ بە چاوەکانم تەماشام نەکردبوو).

هەروەها (عورووەی کوڕی مەسعودی ئەلسەقەفی ) وەصفی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەکرد بۆ قورەیش لە ڕۆژی حودەیبییەدا و فەرمووی: (( واللّهِ إنْ رَأَيْتُ مَلِكًا قَطُّ يُعَظِّمُهُ أصْحَابُهُ ما يُعَظِّمُ أصْحَابُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) مُحَمَّدًا، واللّهِ إنْ تَنَخَّمَ نُخَامَةً إلَّا وقَعَتْ في كَفِّ رَجُلٍ منهمْ، فَدَلَكَ بهَا وجْهَهُ وجِلْدَهُ، وإذَا أمَرَهُمُ ابْتَدَرُوا أمْرَهُ، وإذَا تَوَضَّأَ كَادُوا يَقْتَتِلُونَ علَى وَضُوئِهِ، وإذَا تَكَلَّمَ خَفَضُوا أصْوَاتَهُمْ عِنْدَهُ، وما يُحِدُّونَ إلَيْهِ النَّظَرَ تَعْظِيمًا)) واتە : سوێند بە خوا هیچ پادشایەکم نەبینیوە هاوەڵانی هێندە بە مەزن و گەورە تەماشای بکەن و بە گەورەی بزانن هەروەکو چۆن هاوەڵانی موحەممەد (ﷺ) ئاوا موحەممەدیان بە گەورە دەزانی و تەماشایان دەکرد، سوێند بە خوا ئەگەر تفێکی بکردایە ئیللا دەکەوتە ناو دەستی یەکێکیان، ئەو کەسەیش روخسار و پێستەکەی خۆی پێ دەسڕی، وە ئەگەر فەرمانێکی بکردایە ئەوا پێشبڕکێیان دەکرد بۆ جێ بە جێ کردنی فەرمانەکەی، وە ئەگەر دەستنوێژی بگردایە خەریك بوو بە شەڕ دەهاتن لەسەر پاشماوەی ئاوی دەستنوێژەکەی، وە ئەگەر قسەیان بکردایە لە حزوریدا ئەوا بە ئەسپایی و لەسەرخۆ قسەیان دەکرد، وە هەرگیز بە بەردەوامی تەماشایان نەدەکرد ( زیادەڕەوییان نەدەکرد لە تەماشاکردنیدا ) لەبەر مەزنی و هەیبەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ))

## صيفاتەکانی (ﷺ) بە گشتی :

### ئەدەبی لە گەڵ خوادا :

(عەبدوڵای کوڕی ئەلشیخیر) دەفەرموێت : «فقُلْنَا: أَنْتَ سَيِّدُنَا، فَقَالَ (ﷺ) : السَّيِّدُ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى، قُلْنَا: وَأَفْضَلُنَا وَأَعْظَمُنَا طَوْلًا، قَالَ (ﷺ) : قُولُوا بِقَوْلِكُمْ –أَوْ بَعْضِ قَوْلِكُمْ–، وَلَا يَسْتَجْرِيَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ» واتە : وتمان : تۆ سەیدی ئێمەیت، ئەویش فەرمووی : سەیدی راستەقینە تەنها خوایە، ئێمەش وتمان : تۆ لە هەمومان باشتریت بە فەزڵ و چاکە و لە هەمومان مەزنتریت لە بەخشین و دەسەڵاتدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی : قسەکانی خۆتان بکەن (یان هەندێ لە قسەکانتان) وریابن شەیتان پەلکێشتان نەکات و بتانکاتە وەکیلی خۆی) .

### زیرەکی و بوێری :

عەلی دفەرموێت : «كُنَّا إِذَا حَمِيَ الْبَأْسُ وَلَقِيَ الْقَوْمُ الْقَوْمَ اتَّقَيْنَا بِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) ، فَلَا يَكُونُ أَحَدٌ مِنَّا أَدْنَى إِلَى الْقَوْمِ مِنْهُ».واتە: ئەگەر هەردوو سوپا بە یەکتر بگەیشتایەن و شەڕەکە گەرم بوایە، ئەوا خۆمان دەدایە پاڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، تاوەکو هیچ کەسێك نەبوو لە دوژمن نزیکتر بێت وەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ)) .

### ترسانی لە خوا :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «أَمَا وَاللهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ للهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ» واتە : سوێند بە خوا من لە هەمووتان لە خواترسترم و لە هەمووتان بە تەقواترم))

## صیفاتەکانی (ﷺ) بە گشتی :

**چاکەکردنی لە گەڵ کەسوکارەکەیدا :**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : «خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ، وَأَنَا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي» واتە: باشترینتان ئەو کەسەیە لە گەڵ خێزانەکەیدا باش بێت، وە منیش باشترین کەسی ئێوەم لە گەڵ خێزانەکەی خۆمدا باش بم)).

**شەرم و حەیای :**

ئەبو سەعیدی ئەلخودری دەفەرموێت: «كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا، فَإِذَا رَأَى شَيْئًا يَكْرَهُهُ عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ».واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە شەرمتر بوو لەو کچە عازەبانەی لە بنی ماڵەکەی خۆیاندا دەمێننەوە، وە ئەگەر شتێکی ببینیایە پێی ناخۆش بوایە ئەوا بە روخساریدا دەمانزانی – کە پێی ناخۆشە–)

**کارئاسانی :**

عائیشە دەفەرموێت : «مَا خُيِّرَ النَّبِيُّ (ﷺ) بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلَّا اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَأْثَمْ، فَإِذَا كَانَ الْإِثْمُ كَانَ أَبْعَدَهُمَا مِنْهُ» واتە : هەرگیز پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نێوان دوو کاردا سەرپشك نەکراوە ئیللا سووکەکەی هەڵدەبژارد ئەگەر تاوان نەبوایە، وە ئەگەر تاوان بوایە ئەوا لە هەموو کەس زیاتر لێی بە دوور دەبوو .

**بۆ نەفسی خۆی تۆڵەی نەدەسەندەوە :**

عائیشە دەفەرموێت : «وَاللهِ مَا انْتَقَمَ لِنَفْسِهِ فِي شَيْءٍ يُؤْتَى إِلَيْهِ قَطُّ حَتَّى تُنْتَهَكَ حُرُمَاتُ اللهِ فَيَنْتَقِمَ لِلهِ» واتە : سوێند بە خوا هەرگیز پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆڵەی بۆ نەفسی خۆی نەدەسەندەوە ئەگەر توشی شتێك بوایە، وە ئەگەر قەدەغەکراوەکانی خوا پێشێل دەکرا ئەو کات تۆڵەی دەسەندەوە))

## صیفاتەکانی (ﷺ) بە گشتی :

**هیچ خواردنێکی عەیبدار نەدەکرد :**

عائیشە دەفەرموێت: «مَا عَابَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) طَعَامًا قَطُّ، إِنِ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ».**واتە : هەرگیز پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ چێشتێکی عەیبدار نەدەکرد، ئەگەر پێی رازی بوایە ئەوا دەیخواردو ئەگەر نا ئەوا وازی لێ دەهێنا).**

**دیاری وەردەگرت :**

عائیشە دەفەرموێت : «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ، ويُثِيبُ عَلَيْهَا». **واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) دیاری وەردەگرت و پاداشتیشی لەسەر دەدایەوە).**

**صەدەقەی نەدەخوارد :**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی :** «إِنَّ آلَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) لَا يَأْكُلُونَ الصَّدَقَةَ» **واتە : بزانن کە ئالو محمد (ﷺ) هەرگیز صەدەقە ناخۆن).**

**بێ فیزی و خاکیێتی :**

عوقبەی کوڕی عامیر دەفەرموێت : (( أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) رَجُلٌ فَكَلَّمَهُ، فَجَعَلَ تَرْعُدُ فَرَائِصُهُ، فقالَ لَهُ: «هَوِّنْ عَلَيْكَ؛ فَإِنِّي لَسْتُ بِمَلِكٍ، إِنَّمَا أَنَا ابْنُ امْرَأَةٍ تَأْكُلُ الْقَدِيدَ)) **واتە : کابرایەك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و لە گەڵیدا قسەی دەرکرد کەچی ماسولکەکانی شانی دەلەرزین (لە ترساندا)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو : لەسەر خۆ بە، خۆ من پادشا نیم، بەڵکو من کوڕی ئافرەتێکم کە گۆشتی وشکی دەخوارد) .**

## صیفاتەکانی (ﷺ) بە گشتی :

### خزمەتکردنی کەسوکارەکەی :

لە (ئەلئەسوەدی کوڕی یەزید)ەوە هاتووەو فەرموویەتی : پرسیارم کرد لە دایکە عائیشە : ((مَا كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَصْنَعُ فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ: «كَانَ يَكُونُ فِي مِهْنَةِ أَهْلِهِ -تَعْنِي خِدْمَةَ أَهْلِهِ- فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ)) واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ماڵەکەیدا چی دەکرد ؟ فەرمووی: هەردەم لە خزمەتی خانەوادەکەیدا بوو، جا ئەگەر کاتی نوێژ بهاتایە دەردەچوو بۆ نوێژەکەی).

### پشتگوێ خستنی نەفامەکان :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : «أَلَا تَعْجَبُونَ كَيْفَ يَصْرِفُ اللهُ عَنِّي شَتْمَ قُرَيْشٍ وَلَعْنَهُمْ؟! يَشْتِمُونَ مُذَمَّمًا وَيَلْعَنُونَ مُذَمَّمًا، وَأَنَا مُحَمَّدٌ (ﷺ)».واتە : ئایە سەرسام نابن چۆن خوای گەورە جوێن و لەعنەت کردنی قورەیشم لە کۆڵ دەکاتەوە ؟ ئەوا جوێن بە (مُذَمَّم) زەمکراو دەدەن و لەعنەت لە (مُذَمَّم) زەمکراو دەکەن، کەچی من (محمد)م (ﷺ)).

### ڕاستگۆیی :

عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەفەرموێت : ((حدَّثنا رسول الله (ﷺ) وهو الصَّادق المصدوق)) واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی گێڕاینەوە لە کاتێکدا ئەو راستگۆی باوەڕ پێکراوە ))

### ڕەوشت و ئاکاری لە گەڵ خزمەتکارەکەیدا :

(ئەنەس) فەرموویەتی : «خَدَمْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَشْرَ سِنِينَ فَوَاللَّهِ مَا قَالَ لِي أُفٍّ قَطُّ، وَلَا قَالَ لِشَيْءٍ فَعَلْتُهُ: لِمَ فَعَلْتَ كَذَا، وَلَا لِشَيْءٍ لَمْ أَفْعَلْهُ: أَلَا فَعَلْتَ كَذَا» واتە : دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوام کرد (ﷺ)، سوێند بە خوا هەرگیز بە منی نەگوت : ئۆف، وە هەرگیز بە منی نەگوت بە هۆی شتێکەوە کردبێتم : بۆ وات کرد، وە شتێکم نەکردبێت : بریا وات بکردایە)) .

صیفاتەکانی (ﷺ) بە گشتی :

نەبوونی هیچ جیاوازییەك لە نێوان خۆی و هاوەڵانیدا و کەسێکی سینەساف و میهرەبان بوو :

**ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێت :** ((بَيْنَا نَحْنُ جُلُوسٌ فِي الْمَسْجِدِ دَخَلَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ فَأَنَاخَهُ فِي الْمَسْجِدِ ثُمَّ عَقَلَهُ ثُمَّ قَالَ لَهُمْ: أَيُّكُمْ مُحَمَّدٌ(ﷺ)؟ وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) مُتَّكِئٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ، قَالَ: فَقُلْنَا لَهُ: هَذَا الْأَبْيَضُ الْمُتَّكِئُ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: يَا ابْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): «قَدْ أَجَبْتُكَ»، فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا مُحَمَّدُ (ﷺ) ؛ إِنِّي سَائِلُكَ فَمُشْتَدٌّ عَلَيْكَ فِي الْمَسْأَلَةِ فَلَا تَجِدَنَّ عَلَيَّ فِي نَفْسِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : «سَلْ مَا بَدَا لَكَ»، فَقَالَ الرَّجُلُ: نَشَدْتُكَ بِرَبِّكَ وَرَبِّ مَنْ قَبْلَكَ؛ آللهُ أَرْسَلَكَ إِلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : «اللَّهُمَّ نَعَمْ»، قَالَ: فَأَنْشُدُكَ اللهَ؛ آللهُ أَمَرَكَ أَنْ نُصَلِّيَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : «اللَّهُمَّ نَعَمْ»، قَالَ: فَأَنْشُدُكَ اللهَ؛ آللهُ أَمَرَكَ أَنْ نَصُومَ هَذَا الشَّهْرَ مِنَ السَّنَةِ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) : «اللَّهُمَّ نَعَمْ»، قَالَ: فَأَنْشُدُكَ اللهَ؛ آللهُ أَمَرَكَ أَنْ تَأْخُذَ هَذِهِ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَائِنَا فَتَقْسِمَهَا عَلَى فُقَرَائِنَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : «اللَّهُمَّ نَعَمْ»، فَقَالَ الرَّجُلُ: آمَنْتُ بِمَا جِئْتَ بِهِ، وَأَنَا رَسُولُ مَنْ وَرَائِي مِنْ قَوْمِي، وَأَنَا ضِمَامُ بْنُ ثَعْلَبَةَ أَخُو بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ)) **واتە : لە کاتێکدا ئێمە لە مزگەوت دانیشتبووین کابرایەك بە سواری وشترەکەیەوە هاتە ژوورەوە لە مزگەوتەکەدا یخی دا و ئەمجار بەستییەوە و بەوانی گوت : کام لە ئێوە موحەممەدە (ﷺ) ؟ لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ناویاندا شانی دابووەوە، دەڵێت : ئێمەش وتمان : ئەو کابرا سپییەیە کە شانی داوەتەوە، کابرا پێی گوت : ئەی کوڕی (عەبدولموتەلیب)،**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەوا وڵامتم دایەوە (واتە: گوێم لێتە)، کابرا گوتی : ئەی موحەممەد (ﷺ) من چەند پرسیارێکت لێ دەکەم و لە پرسیارەکانمدا توندم، بۆیە ئاسایی بێت و لات گران نەبێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : پرسیار بکە لەوەی دەتەوێت، کابرا وتی : سوێندت دەدەم بە پەروەردگارەکەت و پەروەردگاری ئەوانەی پێش تۆن، ئایە خوای گەورە تۆی بۆ هەموو خەڵکی رەوانە کردووە ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ سوێند بە خوا، کابرا فەرمووی :- سوێندت دەدەم بە خوا، ئایە خوای گەورە فەرمانی پێت کردووە لە شەو و رۆژێکدا پێنج نوێژ بکەین؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی :- بەڵێ سوێند بە خوا، کابرا وتی : سوێندت دەدەم بە خوا، ئایە خوای گەورە فەرمانی پێت کردووە ئەم مانگە بە رۆژوو بین لە ساڵەکەدا ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : بەڵێ سوێند بە خوا، کابرا وتی : سوێندت دەدەم بە خوا، ئایە خوای گەورە فەرمانی پێت کردووە ئەم صەدەقەیە لە دەوڵەمەندەکانمان وەرگریت و دابەشی بکەیت بە سەر هەژارەکانماندا ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : بەڵێ سوێند بە خوا، کابرا وتی : باوەڕم هێنا بەوەی هێناوتە، وە من نێردراوی قەومەکەی خۆمم، من (زیمامی کوڕی سەعلەبە)م لە تیرەی (بەنی سەعدی کوڕی بەکر) .

| | | |
|---|---|---|
| عائیشە دەفەرموێت : «مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) مِنْ خُبْزِ الشَّعِيرِ يَوْمَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ حَتَّى قُبِضَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ». واتە : هەرگیز ئالو موحەممەد (ﷺ) دوو رۆژ بە سەر یەکدا تێر نانی جۆیان نەخوارد تاکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد )). | نان و خۆراکی : | صیفاتەکانی (ﷺ) بە گشتی : |
| پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «مَا يَسُرُّنِي أَنَّ عِنْدِي مِثْلَ أُحُدٍ هَذَا ذَهَبًا تَمْضِي عَلَيَّ ثَالِثَةٌ وَعِنْدِي مِنْهُ دِينَارٌ إِلَّا شَيْئًا أَرْصُدُهُ لِدَيْنٍ، إِلاَّ أَنْ أَقُولَ بِهِ فِي عِبادِ الله هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا» واتە : پێم خۆش نییە بە ئەندازەی کێوی ئوحود ئاڵتونم هەبێت سێ شەو بە سەریدا بڕوات و تەنها یەك دینارم لێی مابێت، ئیللا مەگەر شتێك بۆ قەرز دامنابێت، ئیللا بەم لاو بەولادا بەسەر عەبدەکانی خوادا دابەشی بکەم )) | زوهد و دونیا نەویستی ( ﷺ ) : | |
| عائیشە فەرموویەتی : «لَمْ يَكُنْ فَاحِشًا وَلَا مُتَفَحِّشًا، وَلَا صَخَّابًا فِي الْأَسْوَاقِ، وَلَا يَجْزِي بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ، وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَصْفَحُ» واتە : بە هیچ شێوەیەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەسێکی بەدگۆ و زمانپیس نەبووە، وە لە بازارەکاندا دەنگ بەرز نەبوو، وە سزای خراپەی بە خراپە نەدەدایەوە، بەڵکو کەسێکی لێبوردە و بەخشندە بوو)). | هەرگیز جوێنی نەدەدا | |

**صیفاتەكانی (ﷺ) بە گشتی :**

**هەرگیز دەستی لە دەستی ئافرەت نەداوە :**

**عائیشە دەفەرموێت :**

«مَا مَسَّتْ كَفُّ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)كَفَّ امْرَأَةٍ قَطُّ» **واتە : هەرگیز پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی نەیداوە لە دەستی هیچ ئافرەتێكی بێگانە).**

**ماڵ و ژیان و گوزرانی :**

**عومەر دەفەرموێت :** (( دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَهُوَ مُضْطَجِعٌ عَلَى حَصِيرٍ فَجَلَسْتُ، فَأَدْنَى عَلَيْهِ إِزَارَهُ وَلَيْسَ عَلَيْهِ غَيْرُهُ، وَإِذَا الْحَصِيرُ قَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِهِ، فَنَظَرْتُ بِبَصَرِي فِي خِزَانَةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَإِذَا أَنَا بِقَبْضَةٍ مِنْ شَعِيرٍ نَحْوِ الصَّاعِ، وَمِثْلِهَا قَرَظًا فِي نَاحِيَةِ الْغُرْفَةِ، وَإِذَا أُفَيْقٌ مُعَلَّقٌ... قَالَ: فَابْتَدَرَتْ عَيْنَايَ، فَقَالَ (ﷺ) : «مَا يُبْكِيكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ؟!» قُلْتُ : يَا نَبِيَّ اللهِ (ﷺ) ؛ وَمَالِي لَا أَبْكِي وَهَذَا الْحَصِيرُ قَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِكَ، وَهَذِهِ خِزَانَتُكَ لَا أَرَى فِيهَا إِلَّا مَا أَرَى، وَذَاكَ قَيْصَرُ وَكِسْرَى فِي الثِّمَارِ وَالْأَنْهَارِ، وَأَنْتَ رَسُولُ اللهِ وَصَفْوَتُهُ وَهَذِهِ خِزَانَتُكَ؟! فَقَالَ (ﷺ): «يَا ابْنَ الْخَطَّابِ؛ أَلَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَنَا الْآخِرَةُ وَلَهُمُ الدُّنْيَا؟» قُلْتُ: بَلَى)) **واتە : چوومە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە كاتێكدا لە سەر حەسیرێك راكشابوو، منیش دانیشتم، ئیزارەكەی لە خۆی نزیك كردەوە و لەوە زیاتر هیچی تری لەبەردا نەبوو، بینیم حەسیرەكە كاریگەری لە سەر جەستەی –تەنیشتی– پێغەمبەری خوا (ﷺ) كردووە، تەماشای خەزینەكەی پێغەمبەری خوام كرد (ﷺ) بینیم كەمێك جۆی تێدایە بە ئەندازەی صاعێك، وە**

هێندەی ئەوە لە لایەکی تری ژوورەکە بوو، وەپێستەیەکیش هەڵواسراو بوو، عومەر دەڵێت : منیش چاوەکانم پڕ فرمێسك بوون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : بۆچی دەگریت ئەی کوڕەکەی خەتتاب ؟ وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، چۆن نەگریم ئەوەتا ئەو حەسیرە کاریگەری لە سەر جەستەت کردووە، وە ئەوەش خەزینەکەتە تەنها ئەوەی تێدایە کە دەیبینم، ئەوەش قەیصەر و کیسرایە وان لەو بەروبوم و روبار و جێگە خۆشەدا، وە تۆیش پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هەڵبژێردراوی ئەوی و ئەوەش خەزینەکەتە ؟ فەرمووی : ئەی کوڕی خەتتاب، ئایە رازی نابیت دوارۆژ بۆ ئێمە بێت و دونیا بۆ ئەوان ؟ وتم : بەڵێ )) .

## تاقیکردنەوەی یەکەم

| پرسیار | ڕاستە | هەڵەیە |
| --- | --- | --- |
| • بەختەوەری بەندەکان لە دونیا و دوارۆژدا پەیوەستە بەرێبازەکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ). | ☐ | ☐ |
| • پێغەمبەران لە باشترین نەسەب و رەچەڵەکی قەومەکەیاندا رەوانە دەکرێن . | ☐ | ☐ |
| • تەواوترین وەصفی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەیە خۆی وەصفی خۆی کردووە: من موحەممەدم (ﷺ) بەندەی خوا و پێغەمبەری ئەوم | ☐ | ☐ |
| • ئاورێشم و حەریر نەرمترن لە دەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ). | ☐ | ☐ |
| • خوای گەورە هێندە رەوشتی تەواو و ئاکاری جوانی لە پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) کۆ کردووەتەوە، وە هێندە زانست و | ☐ | ☐ |
| فەزڵی پێ بەخشیوە کە دەبێتە هۆی دەربازبوون و سەرکەوتن لە دونیا و دوارۆژدا کە بە هیچ کەسێکی تر نەدراوە لەم جیهانەدا)) | ☐ | ☐ |
| • پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەخوێندەوار بووە، نە دەیخوێند و نە دەینوسی، وە هیچ مامۆستایەکی نەبووە لە مرۆڤەکان . | ☐ | ☐ |

• باشترین کەسی سەر زەوی لە نەسەب و رەچەڵەکدا بە رەهایی :

یونس بن متی ☐ محمد بن عبداللّه (ﷺ) ☐

• ناوەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) : هەمووی وەصفن ☐

عەلەمی رووتن و مەبەست لێی تەنها ناسینە ☐ لە چەند صیفاتێکەوە وەرگیراوە

کەمەدح و کەماڵ لە خۆ دەگرێت ☐ هەمووی ☐ یەکەم و دووەم ☐

• (کان خلقه القرآن) واتە : رازی دەبێت بە رازی بوونی ئەو ☐

توورە دەبێت بە توورەبوونی ئەو ☐ هەمووی ☐

• (خلیل اللّه) کێیە؟ ئیبراهیمە ☐ محمدە(ﷺ) ☐ هەمووی ☐

- (كان رسول الله (ﷺ) أزهر اللون) واتە : ☐ گەنم رەنگ ☐ سپی ☐ زۆر سپی
- خۆشترین بۆنی خۆش : ☐ میسکە ☐ ئارەقەی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)
- پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوارشانە بوو واتە: بەژن و باڵای ناوەند بوو ☐
  بەژن وباڵای درێژ بوو ☐
- مۆری پێغەمبەرایەتی : لە نێو شانیدا بوو ☐ لە شێوەی جەستەی دەچوو ☐
  وەکو هێلکەی کۆتر بوو ☐ هەمووی

| خوای گەورە | بەنی هاشیم | ئیسماعیل | کەنانە | قورەیش |
|---|---|---|---|---|
| کەنانەی هەڵبژاردووە لە : | | ☐ | ☐ | ☐ |
| وە قورەیشی هەڵبژاردووە لە : | | ☐ | ☐ | ☐ |
| وە بەنی هاشیم لە : | | ☐ | ☐ | ☐ |
| وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە : | | ☐ | ☐ | ☐ |

| رەچەڵەکی (ﷺ) | ناوی | ناو باوکی | باپیری | باوك باپیری | باپیری گەورە | پێش باپیری گەورە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| هاشم | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| عەبدولموتەلیب | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| عەبدولا | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| موحەممەد (ﷺ) | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| ئیسماعیل | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| ئیبراهیم | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |

| هەر ناوەی بۆ لای ماناکەی خۆی راکێشە: | موحەممەد | ئەحمەد | ئەلعاقیب | ئەلسیراج |
|---|---|---|---|---|
| لە هەموو کەس زیاتر سوپاسگوزاری پەروەردگاری خۆی بووە | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| ئەوەی روناکی دەبەخشێت بە بێ سوتان | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| خاوەنی زۆرێك لە ئاکاری جوان کە سوپاسگوزاری دەبوون | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| هیچ پێغەمبەرێك لە پاش ئەو نییە ئەوەش وەکو ناوی (الخاتم)ە | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |

| پێغەمبەری خوا (ﷺ) | دەستی | بۆنی | مامەڵەکردنی | ڕەوشت و خولقەتی | ترسانی |
|---|---|---|---|---|---|
| باشترین کەس بوو لە | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| نەرمونیانترین کەس بوو لە | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| بۆنخۆشترین کەس بوو لە | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| چاکترین کەس بوو لە | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| توندترین کەس بوو لە | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |

| پێغەمبەری خوا (ﷺ) | بۆ خوا | خواردنێك | بۆ خۆی | صەدەقە | دیاری |
|---|---|---|---|---|---|
| تۆڵەی نەدەسەند | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| تۆڵەی دەسەند | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| عەیبداری نەدەکرد | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| وەریدەگرت و پاداشتی لەسەر دەدایەوە | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| وەری نەدەگرت | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |

**ڕێبازو بەرنامەکەی لە پۆشاك و خواردن و خواردنەوەدا (ﷺ):**

**خۆشەویسترین رەنگ لە لای:**

خۆشەویسترین ڕەنگ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەنگی سپی بووە، فەرمویەتی : ((هِيَ مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ فَالْبَسُوهَا وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ)) واتە : رەنگی سپی لە باشترین پۆشاکەکانتانە، بۆیە لەبەری بکەن و مردووەکانتانی پێ کفن بکەن)).

**پۆشاکەکەی:**

هەر پۆشاك و جلێکی بەردەست بوایە لەبەری دەکرد، هەندێ جار جلی سوف و هەندێ جار لۆکە، جارجاریش کەتان و هەر کات قەمیسەکەی –کراسەکەی– لەبەر بکردایە بە دەستی ڕاست دەستی پێ دەکرد.

**نیوەندبوونی (ﷺ) لە جل و پۆشاکیدا:**

هەندێ لەپێشینان وتویانە : (كَانُوا يَكْرَهُونَ الشُّهْرَتَيْنِ مِنَ الثِّيَابِ الْعَالِي وَالْمُنْخَفِضِ) واتە : پێشینان دوو جۆرە پۆشاکی ناوبانگیان پێ ناخۆش بووە، پۆشاکێکی زۆر بەرز و پۆشاکێکی زۆر نزم))، وە لە فەرمودەیەکی (ئیبن عومەر)ەوە هاتووە : ((مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ أَلْبَسَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَوْبَ مَذَلَّةٍ ثُمَّ تَلَهَّبُ فِيهِ النَّارُ)) واتە : هەرکەسێك پۆشاکی ناوبانگی لەبەر بکات ئەوا خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا پۆشاکی زەلیلی دەکاتە بەری و ئەمجار بە گڕی ئاگر دەیسوتێنێ))، چونکە مەبەستی لێی خۆبەزل زانی و

## ڕێباز و بەرنامەکەی لە پۆشاك و خواردن و خواردنەوەدا ( ﷺ ) :

### نێوەندبوونی ( ﷺ ) لە جل و پۆشاکیدا :

شانازی کردن بووە بۆیە خوای گەورە سزای داوە، هەروەها لە (ئیبن عومەر)ەوە هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلَاءَ لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) واتە : هەرکەسێك پۆشاکەکەی درێژ کردبێتەوە لەبەر فیززلی ئەوا خوای گەورە تەماشای ناکات لە ڕۆژی قیامەتدا)).

### خواردنی ( ﷺ ) :

ئەوەی هەبوایە نەیدەگێڕایەوە و هەرچیش لەبەردەست نەبوایە داوای نەدەکرد، وە هیچ خواردنێك لە پاك و حەلاڵەکان نەبووە ئەگەر لێی نزیك کرابێتەوە ئیللا خواردوویەتی، ئیللا مەگەر حەزی لێی نەبوایە ئەوا وازی لێی دەهێنا و بە بێ ئەوەی بە حەرامی بزانێت، دایکە عائیشە دەفەرموێت : (وما عاب طعاما قط، إن اشتهاه أكله وإلا تركهُ) واتە : هەرگیز پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ خواردنێکی عەیبدار نەدەکرد، ئەگەر حەزی لێ بوایە ئەوا دەیخواردو ئەگەر نا ئەوا وازی لێ دەهێنا ) هەروەکو چۆن گۆشتی بزنمژۆکی نەخوارد چونکە پێی ڕانەهاتبوو ).

### خواردنی ( ﷺ ) :

- زۆرینەی خواردنی لەسەر زەوی لە سەر سفرەیەك دادەنرا.
- وە بە سێ پەنجەکەی نانی دەخوارد.
- وە بە پاڵکەوتنەوە نانی نەدەخوارد.
- وە لە سەرەتای خواردنیدا ناوی خوای دەهێنا، وە لە کۆتاییشدا سوپاسی خوای دەکرد.
- وە کە لە خواردنەکەی دەبویەوە پەنجەکانی دەلێسایەوە.

## ڕێبازو بەرنامەکەی لە پۆشاك و خواردن و خواردنەوەدا (ﷺ):

### خواردنەوەی (ﷺ):

- زۆربەی خواردنەوەکانی بەدانیشتنەوە بووە، بەڵکو قەدەغەی خواردنەوەی بەپێوە کردووەو لێی ڕێگر بووە، وە دروستە بە پێوە بخورێتەوە لەبەر عوزر و بیانوویەك کە ڕێگر بێت لە دانیشتن.
- ئەگەر خواردنەوەیەکی بخواردایە ئەوا پاش خۆی دەیدایە ئەو کەسەی بە لای ڕاستیەوە بوایە، هەرچەندە ئەو کەسەی لای چەپی گەورەتر بوایە.

## ڕێبازەکەی (ﷺ) لە هاوسەرگیری و ڕەفتاری لە گەڵ خێزانەکانیدا:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((حُبِّبَ إِلَيَّ مِنْ دُنْيَاكُمْ: النِّسَاءُ وَالطِّيبُ، وَجُعِلَتْ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ)) واتە : لە دونیاکەتاندا سێ شتم لا خۆشەویست کراوە : ئافرەتان و بۆنی خۆش و بیلبیلەی چاوم لە نوێژەکاندایە ).

وە لە مانەوە و خەرجی و بژێویدا ئەوا بە یەکسانی لە نێوانیاندا دابەشی کردبوو.

دایکە عائیشە دەفەرموێت : ((وَكَانَ إِذَا أَرَادَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ، وَلَمْ يَقْضِ لِلْبَوَاقِي شَيْئًا)) واتە : ئەگەر بیویستایە سەفەر بکات ئەوا لە نێوان خێزانەکانیدا تیروپشکی دەکرد، جا ئەگەر ناوی هەرکەسێکیان دەرچوایە ئەوەیان لە گەڵیدا سەفەری دەکرد، وە بۆ ئەوانی تر قەرەبووی نەدەکردەوە )).

وە هەڵسوکەوتی لەگەڵ هاوسەرەکانیدا بە ڕەفتاری باش و ڕەوشتی جوان بووە.

ڕێبازەکەی (ﷺ) لە هاوسەرگیری و ڕەفتاری لە گەڵ خێزانەکانیدا :

وە کچۆڵەی ئەنصارەکانی دەهێنا بۆ لای دایکە عائیشە تاوەکو یاری لە گەڵ بکەن، وە ئەگەر شتێکی بویستایە و حەرام نەبوایە ئەوا بۆی دابین دەکرد .

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەری دەخستە سەر کۆشی دایکە عائیشە و قورئانی دەخوێند و ڕەنگە دایکە عائیشە لەسوڕی مانگانەشدا بوایە، وە ئەگەر لە سوڕی مانگانەدا بوایە جاری وابوو فەرمانی پێ دەکرد نێوان ناوکی بۆ ئەژنۆی دابپۆشێت، پاشان گەمەو کاری خۆی لەگەڵدا دەکرد.

وە جاری وابوو ماچی دایکە عائیشەی دەکرد لەکاتێکدا بە ڕۆژوو بوو.

وە هێندە نەرمونیان و ڕەفتارچاك بووە، لەگەڵ خێزانەکەیدا یاری دەکرد، و دووجار لە سەفەریدا بە پێ پێشبڕکێی لەگەڵ کردووە، وجارێکیان لەکاتی دەرچونیان لەماڵ پاڵیان بەیەکەوە دەنا.

وە ئەگەر سەفەری بکردایە و بگەڕایەتەوە ئەوا بە شەو لە دەرگای نەدەدا، وە نەهی لەو کارە دەکرد .

ڕێبازەکەی لەخەوتن و هەستان لەخەو

ئەگەر هەموو شەوێك بچوایەتە سەر جێگەکەی بە مەبەستی نوستن دەیفەرموو : ((بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ أَحْيَا وَأَمُوتُ)) : (ئەی خودایە .. بە ناوی تۆوە دەژیمو دەمرم ). ((وَكَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ جَمَعَ كَفَّيْهِ، ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا فَقَرَأَ فِيهِمَا: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ و﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴾ و﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ، يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ وَوَجْهِهِ وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ» واتە : ئەگەر هەموو شەوێك بچوایەتە سەر جێگەکەی

ئەوا هەردوو دەستی کۆ دەکردەوەو ئەمجار فووی پیادەکردن و ئەم سورەتانەی دەخوێندەوە: ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ و﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾ و﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ ئەمجار ئەوەی لە تواناییدا بوایە جەستەی خۆی پێ دەسڕین، سەرەتا لە سەرو دەموچاوو پێشەوەی جەستەی دەستی پێدەکرد، ئەم کارەی سێ جار ئەنجام دەدا ) و «كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْقُدَ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى تَحْتَ خَدِّهِ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ ثَلَاثَ مِرَارٍ» واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر بیوستایە بخەوتایە ئەوا دەستی راستی دەخستە ژێر گۆنای (کولمی) و دەیفەرموو: ئەی خودایە.. لە سزاکەت بمپارێزە لەو رۆژەی کە بەندەکانتی تێدا زیندوو دەکەیتەوە) سێ جار، (( وَكَانَ إِذَا انْتَبَهَ مِنْ نَوْمِهِ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»، ثُمَّ يَتَسَوَّكُ)) واتە : وە ئەگەر لە خەو هەستایە دەیفەرموو : ((سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوای کە زیندووی کردینەوە لە پاش ئەوەی مراندنی( واتە : خەوتن)و زیندووبونەوەش هەر بۆ لای ئەوە)) ئەمجار سیواکی بە دەمی خۆیدا دەهێنا)).

سەرەتای شەو ئەخەوت و کۆتاییەکی هەڵئەستا، وە ڕەنگە سەرەتاکەی بەخەبەر بمایەتەوە لەپێناوی بەرژەوەندی موسڵمانانیدا.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوەکانی دەخەوت بەڵام دڵی نەدەخەوت.

وە ئەگەر بخەوتایە کەس بەخەبەری نەدەهێنایەوە تاکو خۆی بەخەبەر دەهات، خەوتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێکوپێکترین خەو بووە، و بەسوودترین خەویش بووە.

وە هەندێ جار گاڵتەی دەکرد و لە گاڵتەکردنەکەیدا حەق و ڕاستی دەگوت.

وە جاری وابوو تەورییەی دەکرد و لە تەوریەکەیدا لە حەق زیاتر هیچی تری نەدەگوت .

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسی بە خەڵکی دەکرد و خەڵکیش پرسیان پێی دەکرد.

وە سەردانی نەخۆشی دەکرد و شوێنی جەنازە دەکەوت و وڵامی دەعوەتی دەدایەوە و پێداویستی بێوەژن و هەژار و لاوازی دابین دەکرد و لە گەڵ ئەواندا ڕێی دەکرد.

گوێی لە پیاهەڵنانی شیعر بووە و پاداشتی لەسەر داوەتەوە و ئەو شتانەی کەپێی مەدح کراوە بەشێکی کەمە لە صیفاتە جوان و ئاکارە بەرزەکانی، بەڵام مەدحی خەڵکانی تر ئەوا زۆربەی درۆیە.

بەدەستی خۆی نەعلەکەی دەدوورییەوە و هەرخۆی جلەکانی خۆی پینە دەکرد، سەتڵەکەشی پینە دەکرد و مەڕەکەی دەدۆشی و جلەکانی ڕێك دەخست و خزمەتی خۆی و خانەوادەکەی دەکرد، وە لە گەڵیاندا خشتی هەڵدەگەرت بۆ دروستکردنی مزگەوت.

جاروبار لەبرساندا بەردی دەبەستە سکییەوە، وە جاروباریش تێر دەبوو.

چووە بۆ میوانی و میوانیشی هاتووە .

لەناوەڕاستی سەری و پشتی پێی کەڵەشاخی کردووە، هەروەها لای ملی و سەرشانی .

چارەسەری دەکرد و داخی بۆ کەسانی تر کردووە بەڵام خۆی داخ نەکردووە، ڕوقیەی کردووە بەڵام داوای نەدەکرد روقیەی بۆ بکەن، وە کەسی نەخۆشی پاراستووە لەوەی ئازاری داوە.

لە مامەڵەکردندا باشترین کەس بووە، وە ئەگەر قەرزێکی بکردایە ئەوا لەوە باشتری دەگەڕاندەوە.

| | |
|---|---|
| ڕێبازەکەی (ﷺ) لە ڕێکردندا : | خێراترین و باشترین و ڕێکترین کەس بووە لەڕێکردندا.<br>لە هاوەڵانی خێراتر بووە وە بۆ گەیشتن پێی ماندوو دەبوون .<br>وە هەندێ جار بەپێی پەتی ڕێی دەکرد و هەندێ جار بەنەعلەوە.<br>وە هاوەڵانی لەپێشیەوە ڕێیان دەکرد و ئەویش لەدوایانەوە دەڕۆیشت .<br>بەتاك و بەكۆ لەگەڵ هاوەڵەکانیدا ڕێی دەکرد . |
| ڕێبازەکەی (ﷺ) لە زیکرکردندا : | تەواوترین کەس بووە لەزیکرکردنی خوادا، بەڵکو هەموو قسەکانی زیکری خوا و ئەوەی ئەو پێی خۆش بووە . وە لەکاتی هەستانی لەخەو زیکری خوای دەکرد و لەکاتی دەستپێکردنی نوێژ و کاتێك لەماڵەکەی دەردەچوو و کاتێك دەچووە ناو مزگەوتەوە و لەبەیانیان و ئێواراندا، وە لەکاتی پۆشینی جلوبەرگ و کاتێك دەچووە ماڵەوە و کاتێك لێی دەردەچوو، وە لە کاتی چوونە سەر ئاو و لەپێش و پاشی دەستنوێژ و کاتێك گوێی لە بانگ دەبوو، وە لەکاتی بینینی سەرەتای مانگدا و لەپێش و پاش خواردن و لەکاتی پژمیندا ... |

| | | |
|---|---|---|
| سوننەتەکانی فیترەت و پاکۆکانی : | ژماردنی سوننەتەکان | پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَاسْتِنْشَاقُ الْمَاءِ، وَقَصُّ الْأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَنَتْفُ الْإِبِطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ» ونسي الراوي العاشر) واتە : دە ئاكار هەن لەفیترەتن: بڕینی سمێڵ (بەرسوێڵ کردن) و ڕیش هێشتنەوە و سیواك و ئاو هەڵدانە دەم و لووت و نینۆك کردن و شوشتنی گرێی پەنجەکان و لادانی توکی بن باڵ و بەرتاشین و خۆپاككردنەوە بە ئاو ) وە ڕاوی فەرموودەکە دەیەم دانەی لە بیر چووە). |

| | | |
|---|---|---|
| **سوننەتەکانی فیترەت و پاشکۆکانی :** | **ڕاست ڕەوی (ﷺ) :** | ڕاست پۆشینی پێخۆش بووە، لە پێلاو لە پێکردن و سەرشانەکردن و خۆ خاوێنکردنەوە و وەرگرتن و بەخشیندا، وە دەستی ڕاستی بەکارهێناوە بۆ خواردن و خواردنەوە و خۆ خاوێنکردنەوە، وە چەپیشی بۆ سەرئاوکردن و نمونەی ئەوانە لە لابردنی پیسی . |
| | **سەرتاشین** | ڕێبازی لە سەرتاشیندا وابووە، یان هەمووی لادەبرد یان هەمووی دەهێشتەوە. |
| | **ســـــیواك :** | حەزی لە سیواککردن بووە، چ بەڕۆژوو بوایە یان نا سیواکی هەر دەکرد، وە لەکاتی لەخەو هەستانیشیدا سیواکی دەکرد و لەکاتی دەستنوێژدا و لەکاتی نوێژدا و کاتی چوونە ماڵەوەی، وە بە داری ئاراك سیواکی دەکرد. |
| | **بۆنخۆشی :** | بۆنی خۆشی زۆر لەخۆی دەدا و حەزی لەبۆنی خۆش بووە. |
| | **سمێڵ و ڕیش :** | پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : «خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ وَوَفِّرُوا اللِّحَى وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ» واتە : لە گەڵ موشریکەکاندا جیاواز بن، ئێوە ڕیش بهێڵنەوە و سمێڵتان کورت بکەنەوە) |
| | **دیـــاری کردنی کاتەکەی :** | ئەنەس دەفەرموێت : ((وَقَّتَ لَنَا النَّبِيُّ (ﷺ) فِي قَصِّ الشَّارِبِ وَتَقْلِيمِ الْأَظْفَارِ أَلَّا نَتْرُكَ أَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِينَ يَوْمًا وَلَيْلَةً)) واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی بۆ دیاری کردین بۆ بڕینی سمێڵ (بەرسوێل کردن) و نینۆك کردن کە لە چل شەو و ڕۆژ زیاتر نەیهێڵینەوە . |

عائیشە فەرمویەتی : (( مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَسْرُدُ سَرْدَكُمْ هَذَا، وَلَكِنْ كَانَ يَتَكَلَّمُ بِكَلَامٍ بَيِّنٍ فَصْلٍ يَحْفَظُهُ مَنْ جَلَسَ إِلَيْهِ))

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو ئێوە قسەی بە پەلەو بە دوای یەکدا نەدەکرد، بەڵکو بە شێوەیەك قسەی دەکرد روون و ئاشکرا بوو و بەشەکانی لە یەك جیا بوون، هەرکەسێك لای دانیشتایە دەیتوانی لەبەری بکات )

زۆرجار سیٚ جار قسەکەی دووبارە دەکردەوە تاکو بەباشی لێی تێبگەن، وە ئەگەر سەلامی بکردایە سێجار سەلامی دەکرد.

وە ئەگەر پێویست نەبوایە قسەی نەدەکرد (واتە : بە پێی پێویست قسەی دەکرد)، وە بە شێوەی کۆکەرەوەی قسەکان قسەی دەکرد (جوامع الكلم) (واتە : قسەیەکی کەم بۆ مانایەکی زۆر) .

هەر شتێك پەیوەندی بە ئەوەوە نەبوایە قسەی تێدا نەدەکرد، وە تەنها لەو باسانەدا قسەی دەکرد کە ئومێدی پاداشتی لیٚ هەبوایە.

بە هیچ شێوەیەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەسێکی بەدگۆ و زمانپیس و دەنگ بەرز نەبووە.

ڕیبازەکەی لە قسەکردن و پێکەنین و گریان و وتارەکانیدا:

پێکەنینی (ﷺ):

هەموو پێکەنینەکەی زەردەخەنە بووە، وە ئەوپەڕی پێکەنینی ئەوە بووە کە ددانەکانی دەردەکەوت.

گریانی (ﷺ):

بە هەنیسك و دەنگی بەرزەوە نەدەگریا، بەڵکو چاوەکانی پڕ فرمێسك دەبوون تاکو دەکەوتنە ڕێ، وە لە سینگیەوە وەکو دەنگی ویزەویزی ئاوی کوڵاوی لێ دەبیسترا.

گریانەکەی هەندێ جار بە هۆی بەزەیی هاتنەوە بوو بۆ مردوویەك، وە هەندێ جاریش لە ترسی ئەوەی تووشی ئومەتەکەی ببێت و بەزەیی پێیاندا دەهاتەوە، وە هەندێ جاریش لەترسی خوادا و هەندێ جاریش لەکاتی بیستنی قورئاندا.

وتارەکانی (ﷺ):

لەسەر زەوی و مینبەر و وشتر وتاری داوە.

جابر فەرمویەتی : ((وَكَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ وَعَلَا صَوْتُهُ وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ، حَتَّى كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ)) واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر وتاری بدایە چاوەکانی سوور دەبوەوە و دەنگی بەرز دەکردەوە و تووڕە بوونەکەی توند دەبوو، هەروەکو ئەوەی راگەیێنەری سوپا بێت).

هیچ وتارێکی نەدەدا ئیللا بە سوپاس وستایشی خودا دەستی پێ دەکرد.

لە هەموو کاتێکدا وتاری دەدا بەپێی پێویست و بەرژەوەندی گوێگران.

# تاقیکردنەوەی دووەم

| پرسیار: | ڕاست | هەڵە |
|---|---|---|
| • هەرکات کراسەکەی لەبەر بکردایە بە لای ڕاست دەستی پێ دەکرد. | | |
| • زۆربەی خواردنی لەسەر زەوی لە سەر سفرەیەك دادەنرا هەر ئەوەش خوانەکەی بووە. | | |
| • و ئەگەر سەفەری بکردایە و بگەڕایەتەوە بە شەو لە دەرگای ماڵەوەی نەدەدا و نەهی لەو کارە دەکرد. | | |
| • جاروبار لەبرساندا بەردی دەبەستە سکییەوە، وە جاروباریش تێر دەبوو. | | |
| • چارەسەری دەکرد و داخی دەکرد و خۆی داخ نەدەکرد و ڕوقیەی دەکرد و داوای لە کەس نەدەکرد روقیەی بۆ بکەن . | | |
| • هیچ کارێکی نەدەکرد لەو کارانەی ئەو جۆرە کەسانەی کە وەسواسیان هەیە دەیکەن وەکو : بە توندی زەکەری خۆی ڕاکێشێ و کۆکە و ئهم ئهمی زۆر و بازدان و گرتنی پەت و چوونە سەر پلیکانە و لۆکە بخاتە ناو زەکەری خۆی و ئاو بکاتە سەریدا و هەر جارە نە جارێك چاودێری بکات و تەماشای بکات و لە نمونەی ئەو بیدعانەی کە ئەوانە دەیکەن کە توشی وەسوەسە هاتوون. | | |

• خۆشەویسترین ڕەنگ لە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) چ ڕەنگێك بوو؟

سپی ☐ ڕەش ☐ هەر ڕەنگێکی بۆ ڕێککەوتایە ☐

• جلەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) : سوف نەدەپۆشی ☐ لۆکە و کەتان دەپۆشی ☐

هەر جلێك بەردەست بووایە دەیپۆشی ☐ تەنها یەکەم و دووەم. ☐

- جلەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) : جلە گرانبەهاکان بوو ☐
جلە هەرزانەکان لەبەر زوهد و دونیا نەویستی ☐ نێوەند. ☐
- ناوی خودای دەهێنا و حەمد وسەنای دەکرد: لەسەرەتای خواردنەکەیدا ☐
لەکۆتاییەکەیدا ☐ لەسەرەتا و کۆتاییەکەیدا. ☐
- زۆربەی خواردنەوەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) : بەدانیشتنەوە بوو ☐
بە پێوە بوو ☐ هەموویان ☐
- پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی (حُبِّبَ إِلَيَّ مِنْ دُنْيَاكُمْ) : ئافرەت ☐
بۆنی خۆش ☐ هەموویان ☐
- پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (بیلبیلەی چاوەکانم.... :
بەهەشتە ☐ نوێژە ☐ هەمووویان ☐
- ژیانی لەگەڵ هاوسەرەکانی بریتی بووە لە :
جوان مامەڵەکردن ☐ ڕەوشت جوانی ☐ هەمووویان ☐
- ئەنەس فەرمویەتی : ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی بۆ دیاری کردین بۆ بڕینی سمێڵ (بەرسوێل کردن) و نینۆك کردن کە لە ....... شەو و ڕۆژ زیاتر نەیهێڵینەوە)) :
سی ☐ چل ☐ پەنجا ☐
- ڕێبازەکەی لە سەرتاشین بریتی بووە لە : ☐ هەندێکی دەتاشی و هەندێکی دەهێڵایەوە
☐ هەمووی لادەبات یان هەمووی دەهێڵێتەوە
- حەزی لە سیواك کردن بووە، و سیواکی دەکرد : کاتێ بەڕۆژوو دەبوو ☐
کاتێ بەڕۆژوو نەدەبوو ☐ هەردوکیان ☐
- پێکەنینەکەی : هەمووی زەردەخەنە بووە ☐ زۆربەی زەردەخەنە بووە ☐
- نێردراوە بۆ : هەموو خەڵکی ☐ جنۆکە و مرۆڤ. ☐
- باشترین کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ڕەهایی :
فاتیمە ☐ زەینەب ☐ هەمووویان ☐
- جگە لێفەی ئەو وەحی لەلێفەی هیچ ئافرەتێکی تردا بۆ دانەبەزیوە :
حەفصە ☐ ئوم سەلەمە ☐ عائیشە ☐

| پێغەمبەری خوا (ﷺ) | جەنازە | دەعوەتی | بێوەژن و هەژار و کەسی لاواز لە کاتی پێویستیدا | نەخۆش |
|---|---|---|---|---|
| سەردانی کێی دەکرد؟ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| ئامادەی چی دەبوو ؟ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| وەڵامی کێی دەدایەوە ؟ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| لە گەڵ کێدا دەڕۆیشت؟ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |

| لە کردارەکانی (ﷺ) | مەڕەکەی | خشت لە دروستکردنی مزگەوتەکەدا | کراسەکەی بەدەستی خۆی | پێڵاو و نەعلەکەی بە دەستی خۆی | خۆی و کەس و کارەکەی |
|---|---|---|---|---|---|
| دەیدورانەوە | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| پینەی دەکرد | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| دەیدۆشی | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| خزمەتی دەکرد | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| هەڵی دەگرت | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |

| ئەو کارانەی لە فیترەتن | نینۆکەکان | مووی بنباڵ | بەر | ریش (ردێن) | سمێل |
|---|---|---|---|---|---|
| کورتکردنەوەی | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| هێشتنەوەی | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| قرتاندنی | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| هەڵکێشانی | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| تاشینی | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |

| ڕێبازەکەی لە خواردندا | برز | ئیللا | دەیخوارد | وازی لێ دەهێنا بەبێ ئەوەی حەرامی بکات | هەبێت |
|---|---|---|---|---|---|
| نایگێڕێتەوە | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| تەکلیفی نەدەکرد | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| شتێکی خۆشی لێ نزیک بکرایەتەوە | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |
| ئیللا مەگەر نەفسی بۆی نەچێت | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ | ☐ |

| له ئاكارەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) | ئەگەر لێ بوایەتەوە | خواردنێك | بەیەك پەنجە بە پێنج پەنجە وە دووری دەخستەوە بە لەپی (ناو دەستی) | سێ پەنجە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| بە پەنجەكانی دیخوارد | | | | |
| دەیلێسایەوە | | | | |
| ئەو شەریفترین كەس بوو كە | | | | |
| كەسی فیززل دەخوات | | | | |
| كەسی تەماحكار دەخوات | | | | |

| | | |
|---|---|---|
| له تایبه تمه‌ندییه‌کانی ( ﷺ ) | نێردراوە بە حەنیفییەی میهرەبانی : | (ئیبنولقەییم) فەرمویەتی : (دوو ئاکاری لە خۆیدا کۆ کردووەتەوە کە ئەوانیش (حەنیفییە) و (میهرەبانی) یە، جا ئەو (حەنیفییە)یە لە تەوحیددا و (میهرەبانی)یە لە رەوشت و ئەخلاقدا، وە دژی ئەو دوو ئاکارە : شیرك و حەرامکردنی حەڵاڵە). |
| | بۆ مرۆڤ و جنۆکە رەوانە کراوە : | پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : (كان النبي (ﷺ) يُبعث في قومه خاصة وبعثتُ الى الناس كافة) واتە : هەموو پێغەمبەرێك نێردراوە بۆ لای گەلەکەی خۆی بە تایبەتی وە من نێردراوم بۆ هەموو خەڵکی)) . |
| | کتێب و بانگەوازەکەی : | خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ١﴾ إبراهيم |
| | ئایەتەکانی : | گەورەترین ئایەتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) قورئانی پیرۆزە، وە هیچ ئایەتێك نییە کە بۆ پێغەمبەرێکی پێش خۆی هاتبێت ئیللا ئەم بەشێکی لێ بەرکەوتووە. |

## له تایبه‌تمه‌ندییه‌كانی (ﷺ)

| | |
|---|---|
| خۆشویستنی ئه‌و به‌شێكه‌ له‌ دین : | پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ده‌فه‌رموێت : (لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من ولده ووالده والناس أجمعين) واته : هیچ یه‌كێك له‌ ئێوه‌ ئیمانی كامل نابێت تاوه‌كو منی خۆشتر نه‌وێت له‌ كوڕه‌كه‌ی و له‌ باوكی و له‌ هه‌موو خه‌ڵكی ) . |
| حوكمی ئه‌و كه‌سانه‌ی ڕقیان له‌ پێغه‌مبه‌ری خوایه‌ (ﷺ) : | كافره‌ به‌ كوفری گه‌وره‌، خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێت : ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ۝٣﴾ الكوثر. |
| خه‌لیلی خوایه‌ : | پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ده‌فه‌رموێت : ((فإن الله قد اتخذني خليلا كما اتخذ ابراهيم خليلا) واته: خوای گه‌وره‌ منی به‌ خه‌لیلی خۆی داناوه‌ هه‌روه‌كو چۆن ئیبراهیمی به‌ خه‌لیلی خۆی داناوه‌)). (خه‌لیل : بریتییه‌ له‌ به‌رزترین پله‌ی خۆشه‌ویستی). |
| یه‌كێكه‌ له‌ (أولى العزم) : | خوای گه‌وره‌ فه‌رموویه‌تی : ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۖ﴾ الأحزاب. |
| زانسته‌كه‌ی : | پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رموویه‌تی : ( أما إني أعلمكم بالله ) واته: به‌ دڵنیاییه‌وه‌ من له‌ هه‌مووتان زاناترم ده‌رباره‌ی خوای گه‌وره‌)) وه‌ خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێت : ﴿قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّى مَلَكٌ ۖ﴾ الأنعام |

## له تایبەتمەندییەکانی ( ﷺ )

### حوکمی ئەوانەی گوێڕایەڵی دەبن و ئەوانەی سەرپێچی دەکەن :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾ آل عمران **هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:**﴿ وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ ﴾ آل عمران

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی :** (كلكم يدخل الجنة إلا من أبى . قالوا: ومن يأبى يا رسول الله ؟ قال : من أطاعني دخل الجنة ومن عصاني فقد أبى) **واته: هەمووتان دەچنە بەهەشتەوە ئیللا کەسێك نەبێت خۆی نایەوێ.. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کێ بەهەشتی ناوێ؟ فەرمووی: کێ گوێڕایەڵیم بکات ئەوا دەچێتە بەهەشتەوەو کێ سەرپێچی فەرمانەکانم بکات ئەوا خۆی بەهەشتی ناوێ ).**

**وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت :** (جعل الذلة والصغار على من خالف أمري) **واته : زەلیلی و بچووکی دراوەتە ئەو کەسانەی سەرپێچی فەرمانەکانم دەکەن))**

### ئومەتەکەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) :

**خوای گەورە دەفەرموێت :** ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۗ ﴾ (ال عمران) . **پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی :** ((والذي نفسي بيده إني لأطمع أن تكونوا شطر أهل الجنة)). **واته : سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە من خوازیارم ئێوە نیوەی ئەهلی بەهەشت بن )) .**

## لە تایبەتمەندییەکانی (ﷺ)

### شارەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ):

شارەکەی شاری مەککە بوو، خوای گەورە فەرمویەتی :

﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ ﴿٩٧﴾﴾ آل عمران

وە مەککە شارێکە کوشتاری تێدا حەرامە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((إنَّ هَذَا الْبَلَدَ حَرَّمَهُ اللهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللهِ)).واتە : بێگومان ئەم شارە خوای گەورە حەرامی کردووە لەو ڕۆژەوەی کە زەوی و ئاسمانەکانی دروست کردووە، وە حەرامە چونکە خوای گەورە خۆی حەرامی کردووە)، وە مەککە شاری موسڵمانانە تاکو قیامەت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((لا هِجْرَةَ بَعْدَ الفَتْحِ )) واتە : کۆچ کردن نییە لەپاش فەتحی مەککە – واتە : لە مەککەوە بۆ مەدینە–)).

### قیبلەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ):

قیبلەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرەو کەعبەیە، و پێش ئەوە بەرەو (بیت المقدس) بووە، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ ۗ﴾ البقرة)، وە مزگەوتی حەرامیش یەکەم مزگەوتە لەسەر زەوی دروست کرابێت، (ئەبو زەر) فەرموویەتی :

((سألتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عن أول مَسْجِدٍ وُضِعَ فِي الأَرْضِ فقَالَ: الْمَسْجِدُ الْحَرَامُ)) واتە : پرسیارم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد یەکەم مزگەوت لەسەر زەویدا دروست کرابێت کام مزگەوتە، فەرمووی : مزگەوتی حەرام)

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَنْ أتى هَذَا الْبَيْتَ فَلَمْ يَرْفُثْ ، وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَيَوْمَ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ)) واتە : هەرکەسێك هات بۆ سەردانی ئەم مزگەوتە و نەچووە لای خێزانییەوە و سنووری شەرعی نەبەزاند کە گەڕایەوە ئەوا دەگەڕێتەوە هەروەکو ئەو ڕۆژەی لە دایك بووە).

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((صَلاَةٌ فِي المِسْجِدِ الحَرَامِ مائةُ أَلْفِ صَلاَةٍ وَصَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي أَلْفُ صَلاَةٍ وَفِي بَيْتِ المِقْدِسِ خَمْسُمَائَةِ صَلاَةٍ ) ) واتە : تەنها نوێژێك لە مزگەوتی حەرام بەرانبەر بە سەد هەزار نوێژە و تەنها نوێژێك لە مزگەوتەکەی من بەرانبەر بە هەزار نوێژە و لە (بيت المقدس) بەرانبەر بە پێنج سەد نوێژە).

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((لَا تُشدُّ الرّحال إِلَّا إِلَى ثَلَاثَة مَسَاجِد : مَسْجِد الْحَرَام ، وَمَسْجِدي ، وَمَسْجِد الْأَقْصَى) واتە : کۆچ و بار ئامادە ناکرێت ئیللا بۆ سێ مزگەوت نەبێت : مزگەوتی حەرام و مزگەوتەکەی من و مزگەوتی ئەلئەقصا).

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (( إِذَا أَتَيْتُمْ الْغَائِطَ، فَلا تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ, وَلا تَسْتَدْبِرُوهَا، وَلَكِنْ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا )) واتە: ئەگەر چوونە سەرئاو ڕوو مەکەنە قیبلەو پشتیشی تێ مەکەن بەڵکو ڕووبکەنە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا)).

## هاوسەر و کەسە نزیکەکانی:

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەوت منداڵی بووە : سێ کوڕ و چوار کچ :**

١- ئەلقاسم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) کونییەی بە ناوی ئەمەوە بووە (ئەبو لقاسیم).

٢- زەینەب.

٣- روقیە.

٤- ئوم کەلسوم.

٥- فاتیمە.

٦- عەبدوڵا، وە نازناوی (ئەلتەییب) و (ئەلتاهیر) بووە.

٧- ئیبراهیم، ئەویش کوڕی (ماریەی ئەلقیبتییە) بووە، کەنیزەکێکی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، وە ئەو دوای منداڵەکانی تر لە خەدیجەیە، لە هیچ هاوسەرێکی تری جگە لە ئەو منداڵی نەبووە.

هەموو منداڵەکانی لە پێش خۆی وەفاتیان کرد تەنها (فاتیمە) نەبێت، ئەو لە پاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە شەش مانگ کۆچی دوایی کرد، وە لەبەر ئارامگرتن و چاوەڕوانی پاداشت لە خواوە، خوای گەورە پلەو پایەی بەرز کردەوە بە سەر هەموو ئافرەتانی جیهاندا، وە (فاتیمە) باشترین کچی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) بە رەهایی.

وە هەموو کچەکانی گەیشتن بە سەردەمی ئیسلام و هەموویان موسڵمان بوون و لە گەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کۆچیان کرد .

## مامەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، یازدە مامەی هەبووە:

١- حەمزە بە (سيد الشهداء) ناسراو بوو.

٢- ئەلعەبباس.

٣- ئەبو تالیب، و ناوی (عەبدولمەنناف) بووە.

٤- ئەبو لەهەب، و ناوی (عەبدولعوززا) بووە.

٥- ئەلزوبیر.

٦- عەبدولکەعبە.

٧- ئەلموقەویم.

٨- زیرار.

٩- قوسەم.

١٠- ئەلموغیرە، نازناوی (حجل) بووە.

١١- ئەلغەیداق، ناوی (موصعەب) بووە.

هیچ لەمامەکانی موسڵمان نەبوون جگە لە (حەمزە و ئەلعەبباس) نەبێت .

## شەش پورەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

١/ صەفیە، کە دایکی زوبێری کوڕی عەووامە.

٢/ ئوم حەکیمی ئەلبەیزا.

٣/ عاتیکە.

٤/ بەرە.

٥/ ئەروا.

٦/ ئومەیمە.

## هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (حجر صخر سمعة)

**جحز:**

( **پیتی ح** ) = (حەفصە)ی کچی (عومەر)ی کوڕی (ئەلخەتتاب).

( **پیتی ج** ) = (جویریە)ی کچی (ئەلحاریس).

( **پیتی ز** ) = (زەینەب)ی کچی (جەحش) + (زەینەب)ی کچی (خوزەیمە).

**هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (حجر صخر سمعة) :**

**صخر :**

( **پیتی ص** ) = (صەفییە)ی کچی (حویەی) کوڕی (ئەختەب).

( **پیتی خ** ) = (خەدیجە)ی کچی (خوەیلد).

( **پیتی ر** ) = ئوم حەبیبە (رەملە)ی کچی (ئەبو سوفیان).

**سمعة :**

( **پیتی س** ) = (سەودە)ی کچی (زەمعە).

( **پیتی م** ) = (مەیمونە)ی کچی (ئەلحاریس).

( **پیتی ع** ) = (عائیشە)ی کچی (ئەبو بەکر).

( **پیتی هـ** ) = ئوم سەلەمە (هیند)ی کچی (ئەبو ئومەییە).

**خەدیجە :**

یەکەم هاوسەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) (خەدیجەی کچی خوەیلدی قورەیشی ئەسەدی) بووە، پێش پێغەمبەرایەتی هاوسەرگیری لەگەڵ کردووە و ئەو کات خەدیجە تەمەنی چل ساڵ بوو، وە تاکو وەفاتی نەکرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژنی بەسەردا نەهێنا، و هەموو منداڵەکان لە ئەوە جگە لە (ئیبراهیم)، وە خەدیجەش ئەو کەسەیە کە پشتیوانی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) و جیهادی کرد لەگەڵیدا و بە نەفس و بەماڵ لەگەڵیدا بووە، و خودای گەورەش بە (جبریل)دا سەلامی بۆ ناردووە، و ئەمەش تایبەتە و نەزانراوە کەوا بۆ هیچ ئافرەتێکی تر بووبێت و سێ ساڵ پێش هیجرەت کۆچی دوایی کرد.

**سەودە :**

پاش مردنی خەدیجە بەچەند ڕۆژێك هاوسەرگیری لەگەڵ (سەودەی کچی زەمعەی قورەیشی) کرد، و ئەویش ئەو ئافرەتە بوو کە ڕۆژەکەی خۆی دا بە عائیشە.

**عـــائیشـــه:**

دوای (سەودە) پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوسەرگیری کرد لەگەڵ (ئوم عەبدوڵا عائیشە صدیقەی کچی صدیق)، ئەو کەسەی کە لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە پاککرایەوەو خوای گەورە بێ تاوانی سەلماند، خۆشەویستی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بووە, پێش ئەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ بکات فریشتەیەك لە قوماشێکی ئاورێشمدا پیشانی دا و وتی : ((ئەمە خێزانتە))، لەمانگی شەوالدا هاوسەرگیری لەگەڵ کرد لە کاتێکدا تەمەنی شەش ساڵ بوو، وە گواستییەوە لە مانگی شەوالدا لە ساڵی یەکەمی هیجرەت کردنی و تەمەنی نۆ ساڵ بوو، وە جگە لە ئەو هاوسەرگیری لەگەڵ هیچ کچێکی عازەب نەکردووە، وە جگە لە ئەو وەحی لە لێفەی هیچ ئافرەتێکی تردا دانەبەزیوە، وە خۆشەویسترین کەس بووە لە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وە پاکانەکەی لە ئاسمانەوە دابەزی، وە هەموو ئوممەت یەکدەنگن لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی تۆمەتباری بکات بە زینا کافرە، وە زاناترین و فەقیهترین ئافرەتە، بەڵکو تێگەیشتوترین ئافرەتی ئەم ئوممەتەیە و لە هەموویان زاناترە بە رەهایی، وە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دەگەڕانەوە بۆ قسەی ئەو و پرسیاریان لێ دەکرد و فەتوایان لە ئەوەوە وەردەگرت.

**حەفصە:**

پاشان هاوسەرگیری لەگەڵ (حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەتتاب) کرد، حەفصە لەگەڵ هاوسەری پێشوویدا (خونەیس کوڕی حوزافەی سەهمی) موسڵمان بوو بوو، وە لەگەڵ ئەودا کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەمجار لە پاش غەزای ئوحود خونەیس وەفاتی کرد و پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوسەرگیری لەگەڵ حەفصە کرد.

زەینەبی کچی خوزەیمە :

پاشان هاوسەرگیری کرد لەگەڵ زەینەبی کچی خوزەیمەی کوڕی حارسی قەیسی لە بەنی (هیلال ی کوڕی عامیر)، و بە دوو مانگ لە دوای ئەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ کرد کۆچی دوایی کرد، وە ئەویش ئەو کەسەیە کە نازناوی ئومولمەساکین (دایکی هەژاران)ـی هەبوو.

ئوم سەلەمە :

پاشان هاوسەرگیری کرد لەگەڵ (ئوم سەلەمە هیندی کچی ئەبو ئومەیەی قورەیشی مەخزومی)، ئەبو ئومەیەش ناوی (حوزەیفە ی کوڕی موغیرە)یە، و ئەمیش دواهەمین خێزانی پێغەمبەرە (ﷺ) کە وەفاتی کردبێت، ساڵی شەست و دووی کۆچی کۆچی دوایی کرد.

جوەیرییە :

وە هاوسەرگیری کرد لەگەڵ (جوەیرییەی کچی حاریسی کوڕی ئەبو زیراری موصتەلیقیە)، و یەکێك بوو لە کەنیزەکەکانی بەنی موستەلیق، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئەوەی یارمەتی بدات لە گرێبەستی ئازادکردنیدا، ئەویش هەموو پارەی گرێبەستەکەی دا و هاوسەرگیری لە گەڵ کرد.

زەینەبی کچی جەحش :

پاشان هاوسەرگیری کرد لەگەڵ زەینەبی کچی جەحش لەبەنی ئەسەدی کوڕی خوزەیمە، و کچی ئومەیمەی پوریەتی، ئەم ئایەتەش لەبارەی ئەمەوە دابەزیوە : ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا ﴾ الأحزاب: ٣٧﴾، بەوەش شانازی دەکرد بەسەر هاوسەرەکانی تری پێغەمبەردا (ﷺ) و دەیگوت : (زَوَّجَكُنَّ أَهَالِيكُنَّ وَزَوَّجَنِي اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ فَوْقِ سَبْعِ سَمَوَاتٍ) واتە : ئێوە کەس و کارتان بە شووی دان بەڵام من خوای گەورە لە سەرووی حەوت

**زەینەبی کچی جەحش :**

ئاسمانەکانەوە بە شووی دام))، و لەتایبەتمەندیەکانی ئەوەیە کە خودای گەورە خۆی وەلی بووە لەسەرووی ئاسمانەکانەوە دای بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وە لەسەرەتای خیلافەتی (عومەر)دا کۆچی دوایی کرد، سەرەتا هاوسەری (زەیدی کوڕی حاریسە) بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەیدی گرتە خۆی و کردی بە کوڕی خۆی، کاتێ زەید تەڵاقی دا خوای گەورە کردییە خێزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بۆ ئەوەی ئوممەتەکەی چاوی لێ بکەن لە هاوسەرگیری لە گەڵ خێزانی ئەوانەی دەیانگرنە خۆیان و دەیانکەنە کوڕی خۆیان.

**ئوم حەبیبە :**

پاشان (ئوم حەبیبە)ی مارە کرد، و ناویشی (رەملەی کچی ئەبو سوفیان صەخری کوڕی حەربی قورەیشی ئەمەوی)یە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوسەرگیری لە گەڵ کرد لە کاتێکدا ئەو کۆچی کردبوو بۆ حەبەشە، نەجاشی مارەییەکەی گرتە ئەستۆی خۆی کە چوار سەد دینار بوو، وە لەوێوە بۆیان گواستەوە، لەسەردەمی موعاویەی برایدا کۆچی دوایی کرد .

**صەفییە :**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوسەرگیری کرد لەگەڵ (صەفییەی کچی حویەی کوڕی ئەختەب) گەورەی بەنی نەزیر لە نەوەی هارونی کوڕی عیمران برای موسا، بۆیە ئەو کچی پێغەمبەرێکە و هاوسەری پێغەمبەرێکە، وە یەکێك بووە لە جوانترین ئافرەتەکانی جیهان، بوو بە پشکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سەبایەکاندا وەکو کەنیزەکێك و ئەویش ئازادی کرد و ئازادکردنەکەی کردە مارەیی بۆی و ئەوەش بوو بە سوننەتێك.

**مەيمونە :**

پاشان هاوسەرگیری کرد لەگەڵ مەیمونەی کچی حاریسەی هیلالی، و ئەویش کۆتا هاوسەریێتی، لەمەککە هاوسەرگیری لەگەڵ کرد لە عومرەی (قضاء) لە پاش ئەوەی تەحەلولی کرد.

جیاوازی لەوەدا نییە کە کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کرد نۆ هاوسەری لە پاش خۆی بە جیٚ هێشت و یەکەم هاوسەری لە پاش خۆی وەفاتی کرد زەینەبی کچی جەحش بوو لەساڵی بیست و دواهەمینیان (ئوم سەلەمە) بوو لە ساڵی شەست و دوو لەکاتی خیلافەتی یەزیدی کوڕی موعاویە کۆچی دوایی کرد.

# بەشی یەکەم : پێش پێغەمبەرایەتی

| | |
|---|---|
| **لەدایك بوونی (ﷺ) :** | لەساڵی فیل لە شاری مەككە لەدایك بووە، ڕۆژی دوو شەممە لە مانگی (ڕەبیعی یەكەم )، پێش كۆچكردنی بە ٥٣ ساڵ، بەرانبەر بە ساڵی ٥٧١ـی زایینی، وە لەم ساڵە بابەتی فیل ڕوویدا و خوای گەورە ڕێی لێگرتن وەكو پێشهاتێك خوای گەورە پێشكەشی پێغەمبەر (ﷺ) و ماڵەكەی خۆی كرد. |
| **باوكی :** | عەبدوڵای كوڕی عەبدولموتەلیب، كۆچی دوایی كرد لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سكی دایكیدا بوو، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) بە هەتیوی لەدایك بووە. |
| **دایكی :** | ئامینەی كچی وەهەب لە بەنی زوهرەیە، كاتێك وەفاتی كرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێشتا تەمەنی نەبووە حەوت ساڵ. |
| **كەفالەت كردنی :** | دوای مردنی دایكی، (عەبدولموتەلیب) ی باپیری كەفالەتی كرد، پاشان ئەویش كۆچی دوایی كرد لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەمەنی نزیكەی هەشت ساڵ دەبوو، و پاشان (ئەبو تالیب) ی مامی كەفالەتی كرد كە ناوی (عەبدو لمەنناف)ـە. |

دایانەکانی ( مرضعاتە ) ( ﷺ ) :

**سوەیبە :**

مەولای ئەبو لەهەبە، وە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) شیری دا بە (ئەبو سەلەمە عەبدوڵای ی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزومی)، بە شیری (مەسروح)ی کوڕی، وە لە گەڵ ئەوانیش شیری دا بە (حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب ی مامی.

**حەلیمەی ئەلسەعدییە :**

بەشیری کوڕەکەی عەبدوڵای برای ئونەیسە و جوزامە – کە شەیمایە – منداڵەکانی حاریسی کوڕی عەبدولعوززای کوڕی ریفاعەی ئەلسەعدی، و لەگەڵ ئەویش شیری دا بە کوڕە مامەکەی : ئەبو سوفیانی کوڕی حاریسی کوڕی عەبدولموتەلیب.

پەروەرشیاری ( حاضناتە ) ( ﷺ ) :

| ئامینەی دایکی | سوەیبە مەولای ئەبو لەهەب | حەلیمەی کچی ئەبو زوئەیبی سەعدیە |
|---|---|---|

**ئەلشەیما :**

کچی حەلیمەی ئەلسەعدیەیە و لە شیرەوە خوشکی پێغەمبەرە (ﷺ)، لە گەڵ وەفدی (هەوازن)دا هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەویش عاباکەی خۆی بۆ ڕاخست و لە سەری داینیشان وەکو پاراستنی حەقەکەی.

**ئوم ئەیمەن :**

بەرەکەی حەبەشی، پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە باوکیەوە بۆی مابووەوە، لە کاتی لە دایك بوونیدا ئەو مامانی بووە .

وە پێغەمبەری خودا (ﷺ) مارەی کرد لە خۆشەویستەکەی خۆی (زەیدی کوڕی حاریسە) و (ئوسامەی کوڕی زەید)ی لێ بوو.

پەروەرشیاری ( حاضناتە ) (ﷺ) :

ئوم ئەیمەن :

ئەو ئافرەتە بوو کە ئەبو بەکر و عومەر لە پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوون بۆ لای بینیان دەگری، ئەوان بە (ئوم ئەیمەن) یان فەرموو : بە هۆی چییەوە دەگریت ؟ ئەوەی لە لای خوداوەندە چاکتر و باشترە بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ). ئەویش فەرمووی : من باش دەزانم ئەوەی لای خوداوەندە باشترە بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) رۆیشت بۆ جێگایەك زۆر لەوە باشترە کە تیایدابوو، بەڵام بۆ ئەوە دەگریم کە بە مردنی ئەو وەحی لە ئاسمانەوە بڕا، جا هەستی ئەوانی وروژاند و ئەوانیش لە گەڵ ئەودا دەستیان بە گریان کرد )) .

پیشەکەی ( ﷺ ) :

شوانی مەڕی کردووە و ئەوەش هۆکارێك بووە بۆ ئارامگرتنی و بەزەیی هاتنەوەی بە لاوازەکاندا و چاودێری کردنیان.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ( ما بعث الله نبياً إلا رعى الغنم ) فقال أصحابه : وأنتَ ؟ قال : نعم، كنتُ أرعاها على قراريط لأهل مكة)

واتە : خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی رەوانە نەکردووە ئیللا شوانی مەڕەکانی کردووە) هاوەڵانی وتیان : تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی : بەڵێ، من شوانیم دەکرد بۆ خەڵکی مەککە بەرانبەر بە چەند قیراتێك)

بازرگانی و هاوسەرگیری کردنی :

کاتێك تەمەنی بوو بە بیست و پێنج ساڵ بە مەبەستی بازرگانی چوو بۆ شام، وە گەیشتە (بوصرا) و پاشان گەڕایەوە، وە پاش گەڕانەوەی هاوسەرگیری کرد لەگەڵ خەدیجەی کچی خوەیلد، یەکەمین هاوسەری.

**بنیاتنانی کەعبە :**

کاتێك تەمەنی بووە سی و پێنج ساڵ بینای کەعبە هەندێکی لێ ڕوخا بۆیە قورەیش هەستان بە دووبارە بنیات نانەوەی و تیرەکانی قورەیش کەعبەیان دابەش کرد و هەریەکە و لایەکی بەرکەوت، کاتێك بیناکردنەکە گەیشتە لای بەردە ڕەشەکە ڕایان جیاواز بوو سەبارەت بەوەی کێ بەرزی بکاتەوە بۆ شوێنی خۆی، لەسەر ئەو بابەتە چوار یان پێنج شەو مانەوە، پاشان لەنێو خۆیاندا ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کەوا یەکەم کەس دێتە مزگەوتەوە حوکم لە نێوانیاندا بکات، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) یەکەم کەس بوو هاتە ژوورەوە، و ئەویشیان کردە داوەر لە نێوانیاندا، ئەویش داوای کراسێکی کرد و بەردەکەی کردە سەری، پاشان هەر خێڵەو چمکێکیان گرت و بەرزیان کردەوە تا گەیشتە نزیك شوێنەکەی خۆی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەدەستی خۆی لە جێگاکەی خۆی دایینا.

**خەڵوەت کردنی (ﷺ) :**

دایکە عائیشە دەفەرموێت : ( حُبِّبَ إليه الخلاء، فكان يخلو بغار حِراء يتحنثُ – يتعبد – فيه الليالي أولات العدد) واتە : خەڵوەتی لا خۆشەویست بوو، بۆیە لە ئەشکەوتی (حیرا)دا بە تەنها دەمایەوە و لە خەڵوەتدا دەبوو، لەوێ چەند شەوێکی دیاری کراو خواپەرستی دەکرد)، وە ڕقی لە بت و ئاینی گەلەکەی بوویەوە و هیچ شتێك نەبوو لەوە زیاتر ڕقی لێ بێت .

## بەشی دووەم : دەستپێکردنی وەحی

**کاتێك تەمەنی (ﷺ) بووە چل ساڵ ڕووناکی پێغەمبەرایەتی بەسەردا هەڵهات، وە خوای گەورە لەڕۆژی دووشەمەدا بە پەیامەکەی ڕێزی لێنا.**

پێغەمبەرایەتیەکەی ( ﷺ ) ؛

**دایکە عائیشە دەفەرموێت :** ((أَوَّلُ مَا بُدِیءَ بِهِ رَسُولُ اللهِ مِنَ الْوَحْيِ الرؤيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ، ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلاَءُ، وَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ، -وَهُوَ التَّعَبُّدُ- اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَنْزِعَ إِلَى أَهْلِهِ، وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ فَيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا، حَتَّى جَاءَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ؛ فَجَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ اقْرَأْ، قَالَ: مَا أَنَا بِقَارِيءٍ، قَالَ: فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ، قُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِيءٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ، فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِيءٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۞١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ۞٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ۞٣﴾ **العلق)** فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ الله يَرْجُفُ فُؤَادُهُ، فَدَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ بِنْتِ خُوَيْلِدٍ، فَقَالَ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ، فَقَالَ لِخَدِيجَةَ، وَأَخْبَرَهَا الْخَبَرَ : لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي، فَقَالَتْ خَدِيجَةُ: كَلاَّ وَاللهِ، مَا يُخْزِيكَ اللهُ أَبَدًا، إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ، وَتَكْسِبُ الْمَعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ.

فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى ابْنَ عَمِّ خَدِيجَةَ، وَكَانَ امْرَءًا تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ يَكْتُبُ الْكِتَابَ الْعِبْرَانِيَّ فَيَكْتُبُ

مِنَ الإِنْجِيلِ بِالْعِبْرَانِيَّةِ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَكْتُبَ، وَكَانَ شَيْخًا كَبِيرًا قَدْ عَمِيَ، فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: يَا ابْنَ عَمِّ اسْمَعْ مِنَ ابْنِ أَخِيكَ فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: يَا ابْنَ أَخِي مَاذَا تَرَى؟ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللهِ بِخَبَرِ مَا رَأَى فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: هذَا النَّامُوسُ الَّذِي نَزَّلَ اللهُ عَلَى مُوسَى ، يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا، لَيْتَنِي أَكُونُ حَيًّا إِذْ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ : أَوَ مُخْرِجِيَّ هُمْ ؟ قَالَ : نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ إِلاَّ عُودِيَ، وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرُكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا، ثُمَّ لَمْ يَنْشَبْ وَرَقَةُ أَنْ تُوُفِّيَ وَفَتَرَ الْوَحْيُ، قَالَ : بَيْنَا أَنَا أَمْشِي إِذْ سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ، فَرَفَعْتُ بَصَرِي فَإِذَا الْمَلَكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ ، فَرُعِبْتُ مِنْهُ ، فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى :﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ٥﴾ (المدثر) فَحَمِيَ الْوَحْيُ وَتَتَابَعَ.

واته : ( یەکەم شێوازێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەحی بۆ هات خەوبینینی چاك بوو لە خەودا، هیچ خەوێکی نەدەبینی ئیللا هەروەکو رۆژی روناك دەهاتە دی، ئەمجار خەڵوەتی لا خۆشەویست بوو، بۆیە لە ئەشکەوتی (حیراء) تەنها دەبووەوە و لەوێ خواپەرستی دەکرد بۆ چەند شەوێکی دیاری کراو، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای کەس‌وکارەکەی توێشووی بۆ ئامادە بکات، ئەمجار دەگەڕایەوە بۆ لای خەدیجە دیسان هەروەکو ئەوە توێشوی ئامادە دەکرد، تاوەکو ئەو کاتەی حەقی بۆ دابەزی لە کاتێکدا ئەو لە ئەشکەوتی (حیرا)دا بوو، جیریل هات بۆ لای و فەرمووی: بخوێنە، ئەویش فەرمووی: من خوێندەوار نیم، دەفەرموێت: توند بە خۆیەوە نوساندمی (گوشاردمی)

تاوەكو شەكەت بووم، ئەمجار بەریدام و دیسان فەرمووی: بخوێنە، ئەویش فەرمووی : من خوێندەوار نیم، دیسان بۆ جاری دووەم توند بە خۆیەوە نوساندمی (گوشاردمی) تاوەكو شەكەت بووم، ئەمجار بەریدام و دیسان فەرمووی : بخوێنە، ئەویش فەرمووی : من خوێندەوار نیم، دیسان بۆ جاری سێیەم توند بە خۆیەوە نوساندمی (گوشاردمی) تاوەكو شەكەت بووم، ئەمجار بەریدام فەرمووی : ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِی خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَـٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ۝٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ۝٣﴾ ئەمجار پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو ئایەتانەوە –یان بەو بەسەرهاتەوە– گەڕایەوە لە كاتێكدا دڵی دەلەرزی، جا چووە ژوورەوە بۆ لای خەدیجەی كچی خوەیلد –ڕەزای خوای لێ بێت– و فەرموی : داپمۆشن داپمۆشن . ئەوانیش دایانپۆشی تاوەكو ترسەكەی لێ ڕوایەوە، ئەمجار هەواڵەكەی بە خەدیجە گوت و فەرمووی: زۆر لە خۆم ترسام، خەدیجە فەرمووی : نەخێر سوێند بە خوا، هەرگیز خوای گەورە شەرمەزارت ناكات، تۆ كەسێكی پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنی و بەسەر هەژار ونەداراندا دەبەخشی و بەرگەی ئازارەكانی ئەوان دەگری و بەشی خەڵكی نەدار دەدەیت بەوەی كە لای جگە لە تۆ دەستیان ناكەوێ و ڕێز لە میوان دەگریت و لە كاتی بەسەرهات و ڕوداوەكاندا پشتی حەق دەگریت . ئەمجار خەدیجە پێغەمبەری خوای (ﷺ) برد بۆ لای (وەرەقەی كوڕی نەوفەل ی كوڕی ئەسەد ی كوڕی عەبدولعوززا ) – ئامۆزای خەدیجە بوو – ئەو كەسێك بوو لە سەردەمی نەفامیدا چوو بووە سەر دینی گاورەكان، وە كتێبی عیبرانی دەنوسیەوە، جا ئەوەی خوای گەورە ویستی لەسەر بوایە ئەوا ئەو

ئینجیلی بە عیبرانی دەنوسیەوە، هەروەها ئەو کەسێکی بە تەمەن بوو هەردوو چاوی لەدەست دابوو، خەدیجە پێی فەرموو : ئەی ئامۆزاکەم گوێ لە برازاکەت بگرە، وەرەقە پێی فەرموو : ئەی برازاکەم چیت بینیوە ؟ پێغەمبەری خواش (ﷺ) ئەوەی بینی پێی گوت، وەرەقە فەرمووی : ئەمە ئەو وەحی یەیە (ناموس)ەیە کە دابەزیە سەر موسا، خۆزگە من کەسێکی گەنج دەبووم، خۆزگە زیندوو بوایەم کاتێك قەومەکەت دەرت دەکەن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : بۆ ئەوان من دەردەکەن ؟ فەرمووی : بەڵێ، ئەوەی کە تۆ هێناوتە هیچ کەسێك نەیهێناوە ئیللا دژایەتی کراوە، وە ئەگەر گەیشتمە ئەو ڕۆژەی تۆ، ئەوا بەسەرخستنێکی بە هێز سەرت دەخەم، ئەمجار هێندەی پێ نەچوو وەرەقە کۆچی دوایی کرد و وەحی بڕا و ماوەیەك دواکەوت) .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : لە کاتێکدا من ڕێم دەکرد گوێم لە دەنگێك بوو لە ئاسمانەوە، منیش چاوم بەرز کردەوە دەبینم ئەو فریشتەیەی کە لە ئەشکەوتی (حیراء) هات بۆ لام، لەسەر کورسییەك دانیشتوە لە نێوان ئاسمان و زەویدا، منیش لێی ترسام و گەڕامەوە و وتم : دامپۆشن دامبۆشن، خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤ وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ٥ ﴾ ئەمجار وەحی لە دوای یەك دادەبزی ).

## پلەکانی وەحی :

**١/ خەونی ڕاست و دروست :**

ئەوەش دەستپێکی وەحیەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو، دایکە عائیشە دەفەرموێت : ((فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ)) واتە : هیچ خەوێکی نەدەبینی ئیللا هەروەکو ڕۆژی ڕوناك دەهاتە دی)).

**٢/ خستنە دڵ و عەقڵییەوە :**

فریشتەکە دەیخستە دڵ و عەقڵییەوە بە بێ بینینی فریشتەکە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : (( إنَّ الروح الأمين نفث في روعي وأخبرني أنه..)) واتە : بزانن کە جبریل فووی کرد بە دڵمدا و هەواڵی پێدام کەوا ....))

**٣/خۆچواندنی فریشتەکە :**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((ويَتَمَثَّلُ لِي الْمَلَكُ أَحْيَانًا رَجُلًا فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي ما يقول)) واتە : وە هەندێ جار فریشتەکە (واتە : جبریل) خۆی دەکاتە شێوەی پیاوێك و قسەم لەگەڵدا دەکات منیش تێدەگەم لەوەی ئەو دەیڵێت)، و لەم پلەدا هەندێك جار هاوەڵەکانیش دەیانبینی.

**٤/ زڕەی زەنگ :**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ((أَحْيَانًا يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ وهو أَشَدُّهُ عَلَيَّ فَيُفْصَمُ عَنِّي وقد وَعَيْتُ عنه ما قال)) وقالت عَائِشَةُ رضي الله عنها : (( رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عليه الْوَحْيُ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ فَيَفْصِمُ عنه وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقًا)).واتە : هەندێ جار بۆم دێت هەروەکو زرنگەی جەرەس ئەویش لە هەمووی توندترە لەسەرم کە لێم جیا دەبێتەوە جا ئەوەی ئەو گوتی من لێی تێدەگەم)، عائیشە دەڵێت : جاری وا هەبوو پێغەمبەرم (ﷺ) دەبینی وەحی بەسەردا دادەبەزی لە ڕۆژێکی زۆر ساردا و نێو چاوانی عارەقەی پێدا دەهاتە خوارەوە) .
بەڵکو ئەگەر لەسەر وڵاخێك بوایە ئەوا وڵاخەکە چووکی دەدا بە زەویدا .

**پلەکانی وەحی :**

**٥/ فریشتەکە لەسەر شێوەی خۆی :**

فریشتەکەی دەبینی لەسەر ئەو شێوەیەی دروست کراوە، ئەویش ئەگەر خودا بیویستبایە وەحی بۆی دەکرد، ئەمەش دوو جار بەسەریدا هاتووە هەروەك چۆن لەسورەتی (النجم)دا باسکراوە.

**٦/ وەحی لە خوداوە :**

ئەوەش ئەوەیە کەخودا وەحی بۆ کرد لەسەرووی حەوت ئاسمانەکانەوە شەوی میعراج وەکو فەرزکردنی نوێژ و ئەو شتانە.

**٧/ قسەکردنی خودا لەگەڵی :**

خودای گەورە قسەی لەگەڵی کرد هەروەکو چۆن قسەی لەگەڵ موسا کرد بەبێ نێوەندگیری فریشتەیەك.

**یەکەمینی ئایەتانێك بەسەریدا دابەزی ( ﷺ ) :**

پێنج ئایەتی سەرەتای سورەتی (العلق)ی بەسەردا دابەزی :

﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ٥﴾ العلق:(١ ــ ٥)

**پلەکانی بانگەوازەکەی ( ﷺ ) :**

١- پێغەمبەرایەتی (النبوة)

٢- ئاگادارکردنەوەی خزمە نزیکەکانی.

٣- ئاگادارکردنەوەی گەلەکەی.

٤- ئاگادارکردنەوەی هەموو ئەوانەی کەپێش خۆی پێغەمبەریان بۆ نەهاتووە ئەوانیش تەواوی عەرەب دەگرێتەوە.

٥- ئاگادارکردنەوەی هەموو ئەوانەی بانگەوازەکەی پێیان دەگات لە جنۆکە و مرۆڤەکان تا کۆتایی دونیا.

| | |
|---|---|
| **قۆناغەکانی بانگەوازەکەی ( ﷺ ) ی:** | ١- بانگەوازی نهێنی : کە سێ ساڵی یەکەمی پێغەمبەرایەتی خایاند.<br>٢- بانگەوازی ئاشکرا : کاتێك فەرمانی پێکرا :﴿فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ ﴾ الحجر: (٩٤) |

| | |
|---|---|
| **یەکەمین ئەو کەسانەی باوەڕیان پێ هێنا ( ﷺ ) ی:** | لە پیاوان : ئەبوبەکری ئەلصدیق. |
| | لە ئافرەتان : خەدیجەی کچی خوەیلد. |
| | لە منداڵان : عەلی کوڕی ئەبو تالیب. |
| | لە مەوالیەکان: زەیدی کوڕی حاریسە |
| | لە کۆیلەکان : بیلالی کوڕی ڕەباحی حەبەشی. |

| | |
|---|---|
| **هەندێك لەوانەی سەرەتا بوون بە موسڵمان ی** | لەیەکەم ئەو کەسانەی باوەڕیان پێهێنا، لە دوای ئەوانەی باسمان کرد ئالو بەیتەکەی بوون، پاشان عوسمانی کوڕی عەففان و تەڵحەی ی کوڕی عوبەیدوڵا، و زوبێری کوڕی عەووام، و سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص، و عەبدولرەحمانی ی کوڕی عەوف، و خەبابی کوڕی ئەرەت، و سوهەیبی ڕۆمی، و عەمماری کوڕی یاسر، و سومەیەی دایکی، و ئەبو عوبەیدە عامری کوڕی جەرراح، و عوسمانی کوڕی مەزعون، و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەد، و عوتبەی کوڕی غەزوان، ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لە هەموویان بێت. |

- کاتێ موشریکەکان ڕاستبوونی بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و کۆبونەوەی خەڵکیان لەدەوری بینی، بە سەختترین ئازار ئازاریان دا، وە لە شێوازی ئازارەکانیان بۆیان:
- قسە و قسەلۆك کردن کە گوایە پێغەمبەر (ﷺ) جادووگەرە تاکو خەڵکی لێی ڕاکەن و لێی بترسن.
- قسە و قسەلۆك کردن کە گوایە پێغەمبەر (ﷺ) شێتە تاکو خەڵکی بە نەفامی بزانێت.
- قسە و قسەلۆك کردن کە گوایە پێغەمبەر (ﷺ) درۆزنە، ئەوەش بەوە ڕەد دەدرێتەوە کە ئەو لە ناویاندا بە دەستپاك ناسراو بوو بەهۆی ڕاستگۆیی و دەستپاکیەوە.
- گاڵتەکردن بە پێغەمبەر (ﷺ) و بە ئەوەی هێناویەتی.
- نانەوەی ئاژاوە و ژاوەژاو کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەهات بۆ بانگەوازکردنی خەڵکی تاکو نەهێڵن گوێیان لەوەحی و ئەو حەقە بێت کە هێناویەتی.
- پێشوازیکردن لەوانەی لە دەرەوەی مەککەوە دەهاتن بۆ عومرە یان حەج یان جگە لەوان و ئاگادارکردنەوەیان لە پێغەمبەر(ﷺ).
- ئازاردانی جەستەی پیرۆزی، وەکو ئەو جارەی کە (عوقبە ی کوڕی ئەبو موعیت) کردی کاتێك کراسەکەی ڕاکێشا تاکو خەریك بوو

| | |
|---|---|
| ئازاردانی موشریکەکان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانی : | بیخنکێنێت هەتا ئەبو بەکر لێی دوورخستەوە و وێڵاشی وشتری کرد بەسەریدا تاکو فاتیمە ی کچی لەسەری لایبرد.<br>▪ هەوڵدانی کوشتنی کاتێك پێشنیاری ئەوەیان کرد لە گەڵ ئەبوتالیبی مامیدا کە بیگۆڕێتەوە بە (عومارەی کوڕی وەلید) و بیکوژن، هەروەها ئەو کاتەش ویستیان بیکوژن کاتێك ویستی هیجرەت بکات.<br>▪ ئازاردانی ئەو ئیماندارە لاوازانە و توندی و سەختی ئازارەکەیان، هەروەکو چۆن بەردی گەورەیان دەخستە سەر سکی بیلال، وە هەروەها ئەوەی بە (عەمماری کوری یاسر )و جگە لە ئەوان کردیان. |
| هیجرەت بۆ حەبەشە : | کاتێك موسڵمانان ژمارەیان زۆربووەوە بێباوەڕان لێیان ترسان و ئازاردانیان بۆیان زیادی کرد و زیاتر موسڵمانانیان توشی فیتنە دەکرد، بۆیە پێغەمبەری خودا (ﷺ) مۆڵەتی پێدان کۆچ بکەن بۆ حەبەشە و فەرمووی : (إنَّ بها ملكاً لا يُظلَمُ الناسُ عنده) واتە : حەبەشە پادشایەکی تێدایە هیچ کەسێك لای ئەو ستەمی لێ ناکرێت . |
| هیجرەت بۆ حەبەشە : هیجرەتی یەکەم : | لەو کۆچەدا دوازدە پیاو و چوار ئافرەت کۆچیان کرد، لە ناویاندا عوسمانی کوڕی عەففان بوو، و ئەو یەکەم کەس بوو کە دەرچوو، و روقیەی کچی پێغەمبەری خودای (ﷺ) هاوسەری لەگەڵدا بوو، و بە باشترین میوانداری لە حەبەشە مانەوە، پاشان پێیان گەیشت کە قورەیشیەکان موسڵمان بوون، وە ئەم هەواڵەش درۆ بوو، بۆیە گەڕانەوە بۆ مەککە، و |

## هیجرەت بۆ حەبەشە :

**هیجرەتی یەکەم :**

کاتێك بۆیان دەرکەوت کە کارەکە لەپێشتر سەختترە، ئەوەی گەڕایەوە گەڕایەوە، و کۆمەڵێکیان چوونەوە ناو مەککە و ئازارێکی زۆریان لەقورەیشەوە بەرکەوت، لەوانەی کە چوونەوە ناو مەککە عەبدوڵا ی کوڕی مەسعود بوو.

**هیجرەتی دووەم :**

لەو کۆچەدا هەشتاو سێ پیاو و هەژدە ئافرەت دەرچوون، و بەباشترین شێوە لەلای نەجاشی مانەوە، و هەواڵی ئەو باش مانەوەیەش گەیشتە قورەیش، بۆیە عەمری کوڕی عاص و عەبدوڵا ی کوڕی ئەبو رەبیعەیان لەگەڵ کۆمەڵێکدا نارد تاکو لای نەجاشی پیلانیان بۆ دابنێن، و خودای گەورەش فێڵەکەیانی گەڕاندەوە بۆ خۆیان و بەرۆکی خۆیانی گرتەوە.

**موسڵمانبوونی حەمزە و عومەر :**

لەساڵی شەشی پێغەمبەرایەتی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەڵیب موسڵمان بوو کە بە سەربەرزترینی قورەیش ناسراو بوو، بە هۆکاری ئەویش پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەربەرز بوو، پاشان بە بەرەکەتی نزایەکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) عومەری کوڕی خەتتاب موسڵمان بوو، بە ئەوانیش موسڵمانان بەهێز بوون و لەقورەیش پاراستنی.

**دۆڵەکانی ئەبو تالیب :**

ئازاردانی قورەیش بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) زیادی کرد، جا خۆی و ئالو بەیتەکەیان سێ ساڵ لە دۆڵەکانی ئەبو تالیبدا گەمارۆدا، و لە دۆڵەکەدا عەبدوڵا ی کوڕی عەبباس لەدایك بوو، وە بێباوەڕان ئازارێکی زۆری پێغەمبەری خوایان دا (ﷺ)، وە کاتێك لە گەمارۆکە دەرچوون و رزگاریان بوو تەمەنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چل و نۆ ساڵ بوو.

| | |
|---|---|
| **ئەبو تاڵیب وخەدیجە:** **كۆچی دوایی** | وە دوای ئەوە بەچەند مانگێك ئەبوتالیب ی مامی لە تەمەنی هەشتا و حەوت ساڵیدا كۆچی دوایی كرد، وە بە ماوەیەكی كەم دوای ئەوە خەدیجە كۆچی دوایی كرد، بەوەش ئازاردانی بێباوەڕەكان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) زیادی كرد. |
| **دەرچوونی بۆ شاری تائیف:** | خۆی و زەیدی كوڕی حاریسە دەرچوون بۆ (تائیف) بە مەبەستی بانگەواز بۆ لای خوا، چەند ڕۆژێك لەوێ مانەوە كەچی هیچ وەڵامیان نەدرایەوە، لەبەرانبەردا ئازاریان دا و دەریان كرد و بەردبارانیان كرد تاكو پاژنەی خوێناوی بوو، وە پێغەمبەری خودا (ﷺ) جێیانی هێشت و گەڕایەوە بۆ مەككە، پاشان چووە نێو مەككەوە بە داڵدەدانی (موتعیمی ی كوڕی عەدی). |
| **موسڵمان بوونی عەدداس:** | لەڕێگەی گەڕانەوەیدا عەدداسی نەسرانی بینی و باوەڕی پێی هێنا و بەڕاستی زانی. |
| **ئیمانی جنۆكە:** | هەروەها لەسەر ڕێگاكەی لەشوێنێك كە پێی دەوترێت (نەخلە) كۆمەڵێك جنۆكەی بۆ ڕەخسا، حەوت دانە لە ئەهلی (نەصیبین) و گوێیان لەقورئان گرت و موسڵمان بوون. |
| **ئیسرا و میعراج:** | پاشان بەجەستە و ڕۆح شەوڕەوی پێكرا بۆ مزگەوتی ئەقسا و پاشان بەجەستە و ڕۆح بردرا بۆ سەرووی ئاسمانەكان بۆ لای خوای گەورە، لەوێ خوای گەورە قسەی لەگەڵ كرد و نوێژەكانی لەسەر فەرز كرد. |

## خستنەڕووی ئیسلام بۆ هۆزەکان :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەمەککەدا مایەوە بانگەوازی هۆزەکانی دەکرد بۆ لای خوای گەورە، وە لە هەموو مەوسمێکی حەجدا داوای لە هۆزەکان دەکرد بەوەی دالّدەی بدەن بۆ ئەوەی پەیامەکەی خوا بگەیەنێت ئەو کات بەهەشت پاداشتیان دەبێت، بەلاّم هیچ هۆزێك وەلاّمی نەدایەوە، خوای گەورە ئەو فەزلّەی هەلّگرت بۆ ئەوەی ئەنصارەکانی پێ ڕێزدار بکات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتە شەش کەس لە ئەهلی مەدینەو بەوانی گوت، ئەوانیش وەلاّمی خودا و پێغەمبەریان (ﷺ) دایەوە و گەڕانەوە بۆ مەدینە، و بانگەوازی گەلەکەی خۆیان کرد بۆ ئیسلام و تاکو تیایاندا بلاّوە بووەوە کە هیچ مالّێك نەبوو باسی پێغەمبەری خوای (ﷺ) تێدا نەکرێت.

## ئەنساڕ و بەیعەتی عەقەبە :

### بەیعەتی یەکەم :

پاشان لەسالّی دواتر دوازدە پیاوی ئەنساڕ هاتن بۆ مەککە، تێیاندا پێنج کەس بوون لە شەش یەکەمەکە، ئەمجار بەیعەتیان دا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سەر (بەیعەتی ئافرەتان) هەروەکو چۆن لە سورەتی (الممتحنة)دا هاتووە لە لای عەقەبە، پاشان چوونەوە بۆ مەدینە.

### بەیعەتی دووەم :

پاشان لە سالّی دواتر حەفتا و سێ پیاو و دوو ئافرەت هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەوانیش ئەهلی عەقەبەی کۆتایی بوون، وە بەیعەتیان بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دا کە بیپارێزن، هەروەك چۆن هاوسەر و منداڵ و خۆیان دەپارێزن، بۆیە خۆی و هاوەلّەکانی چوون بۆ لایان، وە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دوازدە نەقیبی لێ هەلّبژاردن.

**مۆڵەت دان بە کۆچکردن :**

پێغەمبەری خودا (ﷺ) مۆڵەتی بەهاوەڵەکانی دا کۆچ بکەن بۆ مەدینە، ئەوانیش بە جیا جیا و بەنهێنی دەرچوون، یەکەمین کەس کە کۆچی کرد هەروەکو باسکراوە : (ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزومی) بووە، وە دەڵێن : (موصعەب ی کوڕی عومەیر) بووە، ئەوانیش چوون بۆ لای ئەنصار لەماڵەکانی خۆیاندا، ئەوانیش گرتیانە خۆیان و سەریان خستن و ئیسلام لە مەدینەدا بلاوە بووەوە .

پاشان مۆڵەت درا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچ بکات، ئەویش لەڕۆژی دووشەممە لە مانگی رەبیعی یەکەم لە مەککە دەرچوو، وە ئەو کاتیش تەمەنی پەنجا و سێ ساڵ بوو، و ئەوانەشی لەگەڵی بوون ئەبوبکری صدیق و عامیری کوڕی فەهیرە –مەولای ئەبوبەکر– و ڕێنیشاندەرەکەشیان (عبداللە ی کوڕی ئورەیقیتی ئەل لەیسی)، و خۆی و ئەبوبکر چوونە نێو ئەشکەوتی (سەور)ەوە، و سێ ڕۆژ تیایدا مانەوە، پاشان ڕێگای کەناری دەریایان گرتە بەر.

**چوونە ناو شاری مەدینە :**

پاشان خۆی و ئەوانەی لەگەڵی بوون گەیشتنە مەدینە – ئەویش لەڕۆژی دووشەممە دوازدەی مانگی ربیعی یەکەم – لە قوبا مایەوە لەبەشی سەرەوەی مەدینەوە لەلای خێڵی (عەمری کوڕی عەوف) و بۆ ماوەی چواردە ڕۆژ لایان مانەوە.

**یەکەمین مزگەوت لە ئیسلامدا :**

مزگەوتی قوبائی دامەزراند، ئیبن عومەر فەرمویەتی : ((كان النبي (ﷺ) يأتي مسجد قباء كل سبت ماشياً وراكباً)) واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو شەممەیەك دەچوو بۆ مزگەوتی قوبا، بە پێی و بە سواری)، وە فەرموویەتی: ((صلاة في مسجد قباء كعمرة)) واتە : پاداشتی نوێژێك لە قوبا وەکو پاداشتی عومرەیەك وایە) .

**بنیاتنانی مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) :**

پاشان سواری وشترەکەی بوو و بەڕێکەوت و خەڵکی دەستیان کرد بەقسەکردن لەگەڵی و داوایان لێ دەکرد لەلای ئەوان بمێنێتەوە و جڵەوی وشترەکەیان دەگرت، ئەویش دەیفەرموو : ((خلّوا سبيلها فإنها مأمورة)) واتە : لێی گەڕێن چونکە ئەوە فەرمان پێکراوە)، وشترەکەش لەلای مزگەوتەکەی ئەمڕۆی یخی دا و کەوتە سەر چۆك، ئەو شوێنەش هی سەهل و سوهەیل بوو کە دوو منداڵی بەنی نەجار بوون، لەوێ دابەزی لە ماڵی ئەبو ئەییوبی ئەنصاری، پاشان لەشوێنی بەستنەوەی ئاژەڵەکان (مربد) مزگەوتەکەی بنیات نا بەدەستی خۆی و هاوەڵەکانی، بە سەعاف دارەخورما و خشت، پاشان لەتەنیشتی مزگەوتەکە ماڵی خۆی و هاوسەرەکانی بنیات نا، وە نزیکترینیشیان لەمزگەوتەکەوە ماڵەکەی دایکە عائیشە بوو، پاشان و لە دوای حەوت مانگ لەماڵی ئەبو ئەییوبەوە گواستییەوە و چووە ناو ماڵەکەی خۆی.

**برایەتی :**

دوای ئەوەی مزگەوتەکەی بنیات نا برایەتی دروست کرد لەنێوان کۆچەران –کە ئەوانیش نەوەت پیاو بوون– لە گەڵ ئەنصارەکاندا لەسەر دڵدانەوە و پشتیوانی کردن و یارمەتیدانیان، وە لە دوای مردن ئەبنە میراتگری یەکتر تاکو شەڕی بەدر.

**جوولەکەکان :**

کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ مەدینە و جوولەکەکان بینیان یەکسەر ناسیانەوە و زانیان کە ئەو بەڕاستی پێغەمبەرە (ﷺ) و ئەو کەسەیە کە لە تەوراتدا باسکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا جگە لەچەند کەسێکی کەم نەبێت کەسیان موسڵمان نەبوون، لەوانەش کە موسڵمان بوو زاناکەیان بوو (عەبدوڵای کوڕی سەلام)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە گەڵ عەشیرەتەکانی جولەکەدا ڕێککەوتنامەی ئیمزا کرد کە ئەوانیش : بەنی قینوقاع و بەنی نەزیر و بەنی قورەیزە بوون.

**گۆڕینی قیبلە :**

دوای فەرزبوونی نوێژ لە میعراج، پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕووی لە (بیت المقدس) دەکرد و نوێژی دەکرد، وە پێی خۆش بوو قیبلەکەی بگۆڕدرێت بۆ کەعبە و بەردەوام سەیری ئاسمانی دەکرد و هیواخواز بوو، خوای گەورە ئەم ئایەتەی بەسەردا دابەزاند، کە دەفەرموێت : ﴿قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَاۚ﴾ (البقرة: ١٤٤)، لەساڵی دووەمی کۆچی، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) قیبلەی گۆڕی بۆ کەعبە.

**مۆڵەتدان بە جیهاد :**

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مەدینە جێگیر بوون و کۆمەڵەی ئەنصار دەیانپاراست و بەرگریان لێ دەکرد، ئایەتی: ﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ٣٩ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ ﴾ الحج: ٣٩ – ٤٠) دابەزی، خودای گەورە مۆڵەتی دا بە ئیمانداران شەڕی موشریکەکان بکەن، و لەیەکەمین غەزاکانی غەزای ئەبوا و بوات و عەشیرە و ناردنی هەندێ سرییە بوو.

## غەزای بەدر :

لە ڕەمەزانی ساڵی دووی کۆچی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەگەڵ سێ سەد و چەند پیاوێکی ئیماندار دەرچوون بەمەبەستی ڕێگری کردن لە کاروانێکی قورەیش کە لە شامەوە دەگەڕایەوە، ئەبو سوفیانیش بە کاروانەکە لەڕێگاکە دەرچوو و شەیتانیش قورەیشی فریودا و دەرچوون بۆ شەڕ لە دژی ئیمانداران، و لە بەدر بەیەك گەیشتن و غەزای بەدری گەورە ڕوویدا کە ناونرا ڕۆژی (فرقان) واتە : جیاکەرەوە.

وە کاتێك هەردوو سوپاکە بەیەك گەیشتن پێغەمبەری خودا (ﷺ) داوای لەخودا کرد و لێی پاڕایەوە، خوداش پاڵپشتی کرد لە موسڵمانان بە کۆمەڵە فریشتەیەك هاوکاری موسڵمان بوون و هاوشانیان شەڕیان دەکرد، وە خودای گەورەش سەری خستن بەسەر بێباوەڕاندا و وشەی خۆی سەرخست و بەرز بوویەوە و لەبەدردا حەفتا کەس لە موشریکەکان کوژران، وە لە موسڵمانان چواردە کەس شەهید بوون.

## غەزای قینوقاع :

لەساڵی سێیەمی کۆچی بەنی قینوقاع ڕێکەوتنەکەیان شکاند، بۆیە پێغەمبەری خودا (ﷺ) پازدە ڕۆژ گەمارۆی دان پاشان بەحوکمی پێغەمبەر (ﷺ) ڕازی بوون و ئەویش ئازادی کردن، کە حەوت سەد کەس دەبوون.

## غەزای ئوحود :

لە مانگی شەوالدا غەزای ئوحود ڕووی دا، کاتێك کە قورەیش بە سێ هەزار جەنگاوەرەوە دەرچوون بۆ تۆڵەکردنەوەی کوژراوانی بەدر و هاتن بەرەو مەدینە، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) لەگەڵ نزیکەی حەوت سەد کەس لە هاوەڵانی دەرچوو بۆ ئوحود، و دووڕووەکانیش لێی پەشیمان بوونەوە و گەڕانەوە.

لە سەرەتای ڕۆژەکە سەرکەوتن بۆ موسڵمانان بوو، پاشان خودا موسڵمانانی تاقیکردەوە و سەرکەوتنەکەی گەڕانەوە بۆ موشریکەکان تاکو گەیشتن بە پێغەمبەری خودا (ﷺ) و برینداریان کرد و ددانی پێشەوەیان شکاند، وە ئەو ڕۆژە فریشتەکان هاوشانی شەڕیان دەکرد، و حەفتا لە موسڵمانان شەهید بوون لەناویاندا حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب و موصعەب ی کوڕی عومەیر و ئەنەس ی کوڕی نەزر و حەنزەلەی شۆردراوی دەستی فریشتەکان و چەندانی تر.

وە ئەو ڕۆژە تەڵحە ی کوڕی عوبەیدولآ ئاستێکی باشی پێشکەش کرد تاکو پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی : ((أوجب طلحة)) واتە : تەڵحە بەهەشتی بۆ خۆی واجیب کرد) و پێغەمبەری خودا (ﷺ) و ئیماندارەکان خۆیان دایە پاڵ چیاکە، خوداش دەستی موشریکەکانی لێ دوورخستنەوە.

و ڕۆژی ئوحود ڕۆژی تاقیکردنەوە و جیاکردنەوە بوو، خودای گەورە ئیماندارەکانی تێدا تاقیکردەوە و دووڕووەکانی دەرخست و فەزڵی شەهیدبوونیشی دا بە ئەو کەسانەی خۆی ویستی لێ بوو .

و دوای ئەو غەزایە پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەواڵی دەرچونی قورەیشی بیست کە دەیانویست موسڵمانان لەناوبەرن، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دژیان دەرچوو هەرچەندە ئیمانداران لەو کاتەدا ماندوو شەکەت بوو بوون و کاتێك موسڵمانان گەیشتنە (حمراء الاسد) ئەو هەواڵە گەیشتە قورەیش بۆیە سەرشۆڕ بوون و گەڕانەوە بۆ مەککە.

**ساڵی چواری کۆچی :**

لە ساڵی چواری کۆچی ڕووداوی (بیری مەعونە) ڕوویدا کە حەفتا لە قورئان خوێنانی تێدا کوژرا، وە غەزای بەنی نەزیر ڕوویدا کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) گەمارۆی دان تاکو خودا ترسی خستە دڵیانەوە و پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینە دەریکردن و سورەتی (الحشر) لە باسی ئەواندا دابەزی.

**غەزای ئەلموڕەیسیع :**

لەساڵی پێنجی کۆچی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەرچوو بۆ شەڕکردن لە گەڵ بەنی موصتەڵەق، و بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە، وە لەڕێگای گەڕانەوەیدا تەیەموم دانراو بە شەرع کرا، وە ڕووداوی بوختانەکە ڕویدا، کاتێك دووڕووەکان تۆمەتیان بە دایکی ئیمانداران عائیشە هەڵبەست لەکاتێکدا ئەو پاك و بێ خەوشە، ئەوەش بەسەر خۆی و پێغەمبەردا (ﷺ) بەسەختی تێپەڕی تاکو خوای گەورە پاکی و بەرائەتی لەسورەتی (النور) دابەزاند، وئەوانەش تۆمەتیان بۆ هەڵبەست جەڵد کران.

**غەزای ئەحزاب :**

و لە شەوالی ساڵی پێنجەمی کۆچی غەزای خەندەق (ئەحزاب) ڕوویدا، کاتێك جولەکەکان لەگەڵ قورەیش و هاوپەیمانانیان ڕێککەوتن لەسەر کوشتار لە گەڵ پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانیدا، بۆیە لە (قورەیش و بەنی سولەیم و بەنی ئەسەد و فەزارە و ئەشجەع و جگە لەوان) دە هەزاریان کۆکردەوە و هاتن بەرەو مەدینە.

و سەلمانی فارسی ئاماژەی کرد بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە خەندەقێك هەڵبکەنن بۆ ئەوەی لە ئەو ئەحزابانە بیانپارێزێت، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) بە سێ هەزار کەسەوە دەرچوون و پشتی دابە چیای (سلع)ەوە و خەندەقەکەی خستە پێش خۆیەوە، وە

**غەزای ئەحزاب :**

متمانەی کرد بە هاوپەیمانەکانی لە بەنی قورەیزە بەڵام ئەوان پەیمانەکەیان شکاند و لەگەڵ ئەحزابەکان ڕێککەوتن، بۆیە پێغەمبەری خودا (ﷺ) نوعەیم ی کوڕی مەسعودی بۆ ئەوان و ئەحزابەکان نارد و فێڵی لەگەڵیان بەکارهێنا و نێوانیانی تێکدا، پاشان خوای گەورە سەرباز گەلێکی بە با ناردە سەر ئەحزابەکان و خێوەتەکانیانی هەڵکەند و مەنجەڵ و دەفرەکانیانی سەراوژێر کرد، ئەو بایە ئەوانی هێنایە لەرزە و ترسی خستە دڵیانەوە و سەرشۆڕی کردن، بۆیە بەبێ دەسکەوت گەڕانەوە، و پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەرچوو بۆ بەنی قورەیزە و سەعدی کوڕی مەعاز داوەری ئەوانی کرد، وە دەربارەی ئەم غەزایە سورەتی (الأحزاب) دابەزی.

**ڕێککەوتنامەی حودەیبییە :**

لە ساڵی شەشەمدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ هەزار و چوار سەد لە هاوەڵانی دەرچوو بە مەبەستی عومرە، و کاتێك گەیشتنە حودەیبییە قورەیش ڕێگریان لێکرد بچێتە ناو شاری مەککەوە، وە لەگەڵیان ڕێککەوت کە بۆ دە ساڵ شەڕ بەلاوە بنێن، و ئەوەش بۆ موسڵمانان سەرکەوتن و فەتحێك بوو هەروەك خوای پەروەردگار ئەفەرموێ :

﴿إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا ١﴾ئەوەی لە ڕێککەوتنەکەدا لەسەری ڕێککەوتبوون ئەوەبوو کە قورەیش ساڵی داهاتوو ڕێگە بدەن بە ئیمانداران بچنە نێو مەککەوە بۆ عومرە کردن، ئەوانیش لە ساڵی حەوتەم و لە مانگی (زیلقەعیدە) عومرەی قەزایان ئەنجام دا .

**غەزای خەیبەر :**

دوای گەڕانەوەی لە حودەیبییە بە بیست ڕۆژ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرچوو بۆ خەیبەر لە باکووری مەدینە و نزیکەی بیست شەو گەمارۆی جولەکەکانی دا کە موسڵمانەکان کۆششێکی زۆریان کرد، وە کاتێك جوولەکەکان دڵنیا بوونەوە لە لەناوچوونی خۆیان داوای ڕێکەوتنیان لێکرد ئەویش لەگەڵیان ڕێکەوت لەسەر ئەوەی کەوا خوێنیان پارێزراو بێت و لە خەیبەر دەرچن بە تەنها ئەو جلانەی لەبەریاندایە، ئەمجار بەکاری هێنان لەسەر زەوییەکەی خۆیان لەسەر نیوەی داهاتەکەی .

**گەڕانەوەی جەعفەر :**

کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە خەیبەر بوو ئەبو هورەیرە بە موسڵمانی هات بۆ مەدینە، وە هەر لەو کاتەدا جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب ی ئامۆزای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و لەگەڵ ئەوانەی لە حەبەشە مابونەوە هاتنەوە بۆ مەدینە و لە خەیبەر لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بەیەك گەیشتن، وە ئەشعەرییەکانیش لە گەڵیاندا هاتن، واتە: ئەبو موساو هاوەڵانی.

**غەزای موئتە :**

لەساڵی هەشتەمدا غەزای موئتە ڕوویدا، هۆکارەکەشی کوشتنی نێردراوەکەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بۆ لای پادشای ڕۆم لە لایەن (شرحبيل ی کوڕی عەمری غەسانی)یەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ هەزاری لە هاوەڵای نارد و (زەیدی کوڕی حاریسە) ی خۆشەویستی کرد بە ئەمیر بەسەریانەوە و فەرمووی : ((إن أصيب زيد فجعفر ابن أبي طالب على الناس وإن أصيب جعفر فعبدالله بن رواحة)) واتە : ئەگەر زەید پێکرا ئەوا جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب

**غەزای موئتە :**

بەرپرسی ئەو خەڵکە دەبێت و ئەگەر جەعفەر پێکرا ئەوا عەبدوڵای کوڕی ڕەوواحە دەبێتە بەرپرسیان).
هیرەقل و هاوپەیمانەکانی لە عەرەب بە دوو سەد هەزار کەسەوە دەرچوون لە دژیان، وە لە موئتە بەیەك گەیشتن و جەنگەکە ڕوویدا، و ئەمیرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) شەهید بوون، پاشان خالیدی کوڕی وەلید ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت و بەباشی سەرکردایەتی سوپاکەی کرد و موسڵمانانی دوور خستەوە تاکو لە دوژمنانی خوا و دوژمنانی خۆیان ڕزگاری کردن.

**فەتحی مەزنی مەککە :**

و لە هەمان ساڵدا، خێڵی (بەنی بەکر) کە هاوپەیمانی قورەیش بوون هێرشیان کردە سەر خێڵی (خوزاعە) کە هاوپەیمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوون، و قورەیش بەشاراوەیی پاڵپشتی کردن، کاتێك ئەو هەواڵە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشت بڕیاری دا فەتحی مەککە بکات، وە ئەبو سوفیان هات بۆ مەدینە بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بکات بەڵام گوێی بۆ نەگرت، وە قسەی کرد لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەر و عەلی بۆ ئەوەی وەکو نێوەندێك قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەن بەڵام ئەوانیش ڕەتیان کردەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای لەخودا کرد چاوی قورەیش کوێر بکات بۆ ئەوەی بەدەرچوونی بەرەو مەککە نەزانن ئەویش وەڵامی دایەوە، و پێغەمبەری خواش (ﷺ) بە دە هەزار جەنگاوەرەوە دەرچوو تاکو چووە ناو مەککەوە، و پێش فەتح بە ماوەیەکی کەم عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیبی مامی پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمان بوو.

**فەتحی مەزنی مەککە :**

وە لەو وتانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکاتی فەتحی مەککەدا فەرمووی : ((مَنْ دَخَلَ دَارَ أَبِي سُفْيَانَ فَهُوَ آمِنٌ، وَمَنْ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَهُوَ آمِنٌ، وَمَنْ أَغْلَقَ عَلَيْهِ بَابَهُ فَهُوَ آمِنٌ)) واتە : هەرکەسێك بچێتە ماڵەکەی ئەبو سوفیانەوە ئەوا لە ئەماندایە و هەرکەسێك بچێتە ناو مزگەوتی حەرامەوە ئەوا لە ئەماندایە و هەرکەسێك دەرگاکەی لەسەر خۆی داخست ئەوا لە ئەماندایە))، و شەڕی لەگەڵ کەس نەکرد مەگەر ئەوانەی خۆیان سەرەتا دەستیان بەشەڕ کردبێت، جگە لەکۆمەڵێکی کەم نەبێت لەوانەی کە ئازاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) و موسڵمانانیان دابوو خوێنی حەڵاڵ کردن، و کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە نێو مەککەوە تەواف بەیتی کرد بە بێ ئەوەی ئیحرام بپۆشێت، پاشان بانگی عوسمانی کوڕی تەڵحەی کرد و کلیلی کەعبەی لێ وەرگرت و هەرچی بت لەناو و دەور و بەری کەعبەدا هەبوو شکاندی، پاشان کلیلەکەی گێڕایەوە بۆ عوسمانی کوڕی تەڵحە، وە پاش فەتحی مەککە خەڵکێکی زۆر موسڵمان بوون، بەڵکو وای لێهات هۆزەکان پۆل پۆل ئەهاتن بۆ لای پێغەمبەری خواو (ﷺ) موسڵمان دەبوون.

**روخان و شکاندنی بتەکان :**

دوای ئەوەی خوای گەورە مەککەی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەتح کرد، هاوەڵانی نارد بۆ شکاندنی بتەکانی دەورو بەری مەککە، عەمری کوڕی عاصی نارد بۆ شکاندنی (سواع)، و سەعدی کوڕی زەیدی نارد بۆ شکاندنی (مەنات)، و خالیدی کوڕی وەلید بۆ شکاندنی (ئەلعوززا)، و (توفەیلی) نارد بۆ شکاندنی (زیلکەففەین) و عەلی نارد بۆ شکاندنی بتی (تەی) .

**غەزای حونەین :**

کاتێك عەشیرەتی هەوازن هەواڵی فەتحی مەککەیان بیست ڕێیان گرتەبەر بەرەو پێغەمبەر (ﷺ) و لەگەڵ خۆیاندا ماڵ و ژن و منداڵەکانیان هێنا، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) بە دوازدە هەزار کەسەوە بۆیان دەرچوو، بۆیە موسڵمانان سەرسام بوون بەزۆری خۆیان تاکو گەیشتنە دۆڵی حونەین، جا هەوازن فشاریان خستە سەر موسڵمانان بە یەکەوە وەکو فشاری تەنها کەسێك تاوەکو خەڵکی لە دەوری پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆبوونەوە و خۆیان دایە پاڵ ئەو لەبەر زۆری ترسەکە، وە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) هەندێك لە موهاجیرین و ئالو بەیتەکەی خۆی مانەوەو خۆراگر بوون، پاشان خوای گەورە ئیمانداران جێگیر کرد و گەڕانەوە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوشانی شەڕیان کرد تاکو خودا سەری خستن بەسەر دوژمنەکانیاندا، وە هەوازن هەڵهاتن بۆ تائیف.

پاشان چواردە پیاو لە هەوازنەوە بە موسڵمانی هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و داوایان لێکرد منەتی خۆی برژێنی بە سەریاندا بە گەڕانەوەی دیل و کەنیزەکەکان ئەویش ئەوەی لای بوو گەڕانییەوە و خەڵکیش کارەکەی ئەویان کرد .

**غەزای تائیف:**

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەوازن بووەوە، بڕیاری دا غەزای تائیف بکات، بۆیە ڕۆیشت بۆ ئەوێ و هەژدە ڕۆژ گەمارۆی قەڵاکەی دا، پاشان بەبێ شەڕکردن گەڕایەوە.

وە لەساڵی نۆیەمدا غەزای تەبوك ڕوویدا (غەزای ئەلعوسرە)، و لەکاتێکی زۆر گەرمدا روویدا، لە کاتێکدا دارەکان بەرهەمیان پێگەیشتبوو وە سێبەرەکان خۆش بوو بوون، بۆیە دەرچوون بۆ ئەو شەڕە، ئەو شەڕە زۆر سەخت بوو لەسەر خەڵکی، کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی دەربچێت هانی خەڵکی دا لەسەر بەخشین، بۆیە عوسمانی کوڕی عەففان سێ سەد وشتری بە زین و رەشمە و هەموو پێداویستییەکانیەوە و هەزار دیناریشی لە گەڵدا بوو بەخشی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو کاتە فەرمووی : ((ما ضر عثمان ما عمل بعد الي اليوم)) واتە: چیتر لە ئەمڕۆوە عوسمان هەر کارێك بکات زەرەر ناکات ))، و هاوەڵەکانیش هەرچی لەتوانایاندا بوو بەخشیان.

هەموو دووڕووەکان لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دواکەوتن، وە سێ لەباشترین هاوەڵەکان بەبێ هیچ بیانویەك دواکەوتن ئەوانیش (کەعب ی کوڕی مالیك و هیلال ی کوڕی ئومەییە و مورارەی کوڕی ئەلرەبیع) بوون، کاتێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینە چوون بۆ لای داوای لێبوردنیان لێکرد، وە ئەو ئایەتانەی سورەتی (التوبة) دەربارەی ئەوان دابەزی : ﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ ﴾، وە خوای گەورەش لێیان خۆش بوو کاتێك ڕاستگۆیی ئەوانی بۆ دەرکەوت، وە خوای گەورە لەم سورەتەدا لۆمەی دووڕوەکانی و کرد و هەر بە باسی ئەوان سورەتەکەی کۆتایی پێ هێنا، بۆیە ئەو سورەتە ناونرا سورەتی (الفاضحة) چونکە خوای گەورە ئەوانی سووك و ریسوا کرد.

**غەزای تەبوك :**

وە هەر لەم غەزایەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێکەوتنی کرد لەگەڵ (صاحب أيلة)دا لەسەر پێدانی سەرانە، هەروەها لە گەڵ خەڵکی (جەربا و ئەزرەح)دا و نوسراوێکی بۆ نووسین، هەروەها ڕێککەوتنی کرد لە گەڵ (ئوکەیدر دۆمە) لەسەر پێدانی سەرانە، وە پێغەمبەری خودا (ﷺ) چەند شەوێك لە تەبووك مایەوە و پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە و هیچ شەڕێکی نەکرد، وە کاتێك گەڕایەوە بۆ مەدینە خوای گەورە فەرمانی پێکردن مزگەوتی (زیرار) بڕوخێنێت کە دووڕووەکان بنیاتیان نابوو ﴿ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ (التوبة: ١٠٧) پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو مزگەوتەی ڕووخاند، ئەمەش دوایین غەزای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو بە خۆی بەشداری تێدا کردبێت.

**نوێنەرەکان ( وەفدەکان ) :**

دوا بە دوای غەزای تەبووك عەشیرەتی (سەقیف) موسڵمان بوون، وە ساڵی نۆیەم بەساڵی نوێنەرەکان (وەفدەکان) ناونرا، وای لێهات خێڵەکان بە موسڵمانی دەهاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وە لەناویانیشدا نوێنەری (بەنی تەمیم) و گەورەکەشیان (عەتاردی ی کوڕی حاجیب ی تەمیمی) لە گەڵدا بوو، وە نوێنەری (تەی) و گەورەکەیان (زەیدو لخەیل) و نوێنەری (عەبدولقەیس) و گەورەکەیان (ئەلجارودی ئەلعەبدی) و نوێنەری (بەنی حەنیفە) و لەناویاندا (موسەیلەمەی درۆزن) هەبوو کە دواتر بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد.

**حەجەکەی ئەبوبەکر :**

لەساڵی نۆیەم پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبوبەکری وەکو ئەمیری حەج ڕەوانە کرد، ئەویش حەجی بە خەڵکی کرد، وە عەلی نارد بۆ ئەوەی سەرەتای سورەتی تەوبە بەسەر خەڵکیدا بخوێنێتەوە و پەیمان و بەڵێنەکان بگێڕێتەوە بۆ موشریکەکان (واتە : هەڵوەشاندنەوەی هەموو ڕێککەوتنەکان) و لەناو خەڵکیدا بانگەوازی کرد کە لە دوای ئەمساڵەوە هیچ موشریکێك حەج نەکات و هیچ کەسێك بە ڕووتی تەواف کەعبە نەکات هەروەك لە سەردەمی نەفامیدا دەکرا.

**حەجی ماڵئاوایی :**

وە لە ساڵی دەیەمدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەجی ماڵئاوایی کرد، وە موسڵمانان لە هەموو هۆز و تیرەو ولاتێکەوە لەگەڵی دەرچوون تاکو ژمارەیان گەیشتە سەد هەزار کەس، پێغەمبەری خواش (ﷺ) مەناسیکەکانی حەجی فێرکردن، وە لە ڕۆژی عەرەفەدا وتاری بۆ دان و ئەم ئایەتەی خوێندەوە، ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾، هەواڵی پێدان کە ئاینی ئیسلام تەواو کرا و وەسێتی پێکردن دەست بەوەوە بگرن کە لە قورئان و سوننەتدا هاتووە و خوێن و ماڵ و ناموسیان (أعراض)یان لەیەکتر حەرامە، ئەوەش وتاری ماڵئاوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو.

**ناردنی ئوسامە :**

لە مانگی سەفەری ساڵی یازدە پێغەمبەری خودا (ﷺ) سوپایەکی ئامادە کرد بۆ کوشتاری ڕۆمەکان و ئوسامەی کوڕی زەیدی کردە ئەمیر بەسەر ئەو سوپاوە، ئەویش دەرچوو و لە (ئەلجەرەف) سوپاکەی لادا، پاشان هەواڵی نەخۆش کەوتنی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) پێگەیشت.

پوختەی غەزا و نێردە و سریەكانی ( ﷺ ) :

غەزا و نێردە و سریەكانی هەمووی دوای كۆچ بوون لە ماوەی دە ساڵدا، وە سریە و نێردەكانی نزیكەی شەست دانە دەبوون، و غەزاكانیشی بیست و حەوت غەزا بوون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی لە نۆ دانەیدا بەشداری كردووە ئەوانیش : بەدر و ئوحود و خەندەق و قورەیزە و موصتەلیق و خەیبەر و فەتح و حونەین و تائیف و لەهەندێكیدا قورئان دابەزی :

ئەوەی لە قورئان دابەزیوە لەسەر غەزاكانی ( ﷺ ) :

غەزای بەدر : تیایدا سورەتی ئەنفال دابەزی، و پێی دەوترێت سورەتی بەدر.

غەزای ئوحود: كۆتایی سورەتی (آل عمران) دابەزی لە ئایەتی:﴿وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَـٰعِدَ لِلْقِتَالِ﴾ تاكو كەمێك پێش كۆتاییەكەی.

غەزای خەندەق و بەنی قورەیزە و خەیبەر : تیایاندا سەرەتای سورەتی ئەحزاب دابەزی.

غەزای بەنی نەزیر : تیایدا سورەتی (الحشر) دابەزی.

غەزای حودەیبییە و خەیبەر : سورەتی (الفتح)ی تیا دابەزی، و تیایدا ئاماژە كراوە بە فەتح، و بەڕوون و ئاشكرایی لە سورەتی (النصر)دا باسی فەتح كرا.

غەزای تەبووك : تیایدا چەند ئایەتێك لەسورەتی (التوبة) دابەزی.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەیەك غەزادا بریندار کرا ئەویش غەزای ئوحود بوو، و لە بەدر و ئوحود و حونەیندا فریشتە لەگەڵیدا جەنگان، وە لە ڕۆژی خەندەقدا فریشتەکان دابەزین و موشریکەکانیان هێنایە لەرزە و بەزاندیان، وە لەو غەزادا وردە بەردیان فڕیێ دایە دەموچاوی موشریکەکان و ئەوانیش هەڵاتن، و فەتح لە دوو غەزادا بوو : بەدر و حونەین، و لەیەك غەزادا بە مەنجەنیق شەڕی کرد ئەویش غەزای تائیف بوو، و لەیەکێکیاندا قەڵابەندی کرد ئەویش خەندەق بوو – ئەویش غەزای ئەحزاب بوو– کە سەلمانی فارسی ئاماژەی پێکردبوو.

پاشان خوای گەورە پێغەمبەرەكەی (ﷺ) سەرپشك كرد لە نێوان دونیا یان گەیشتن بەخوای گەورە و بەهەشت ئەویش گەیشتن بە خوا و بەهەشتی هەڵبژارد، بۆیە بە نەخۆشییەكی سەخت نەخۆش كەوت، مۆڵەتی لە خێزانەكانی وەرگرت لە كاتی نەخۆشیەكەیدا لەماڵی عائیشە بمێنێتەوە ئەوانیش مۆڵەتیان پێیدا، كاتێك نەیتوانی پێش نوێژی بە هاوەڵانی بكات لە مزگەوت فەرمانی كردە ئەبوبەكر پێشنوێژی بكات، ئەوەش وەكو ئاماژەیەكە بۆ شایستە بوونی بەخەلیفە و جێنشینی پێغەمبەر (ﷺ) دوای خۆی.

لە ڕۆژی دوو شەممە دوازدەی ڕەبیعی یەكەم ساڵی یازدەی كۆچی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەرچوو بۆ ناو خەڵكی لە كاتێكدا ئەوان نوێژی بەیانیان دەكرد و پەردەكەی بەرزكردەوە و دەرگاكەی كردەوە تاكو بینیان، ئاماژەی بۆ كردن نوێژەكەیان تەواو بكەن و زەردەخەنەیەكی بۆ كردن، كاتێك ڕۆژ گەیشتە چێشتەنگاو پێغەمبەری خوا (ﷺ) كۆچی دوایی كرد، وە مردنەكەی گەورەترین كارەسات بوو بەسەر ئوممەتەكەیدا هاتبێت، بۆیە موسڵمانان بە مردنی بە خەمێكی زۆر خەمبار بوون .

پاشان خەڵكی كۆدەنگ بوون لەسەر ئەبوبەكر و بەیعەتی خیلافەتیان پێدا، و هیچ كەس لە بەیعەت پێدانی دوانەكەوت، چونكە پێش

هەموویان موسڵمان بووە و فەزڵی هەیە بەسەر هەموو ئەم ئوممەتەوە لە پاش پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) شۆردرا و لەسێ پارچەی سپیدا کفن کرا، پاشان لەو شوێنەدا نێژرا کە تێیدا وەفاتی کردبوو، لە ژوورەکەی دایکی ئیمانداران عائیشە، و ئەوەش سوننەتی خوای گەورەیە لە پێغەمبەرەکانیدا کە لەو جێگادا دەنێژرێن کە تێیدا وەفاتیان کردووە، مرۆڤەکان و جنۆکەکانیش نوێژیان لەسەری کرد سەڵات و سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێت، ئێمەش شایەتی ئەوە دەدەین کە ئامانەتەکەی بە جوانی گەیاند و ئامۆژگاری ئوممەتەکەی کرد و بە باشترین شێوە جیهادی کرد لەپێناوی خوادا، بۆیە خوای گەورە پاداشتی بە خەیری بداتەوە و سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان.



## کۆتایی:

حەسسانی کوڕی سابیت شاعیری پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت :

يَــــا رَبّ! فاجْمَعنا معاً ونَبِيَّنَا    فِي جَنّــــةٍ تُثْـــنِي عُيُـــونَ الحُسَّـــدِ
فِي جَنّةِ الفِرْدَوْسِ واكتُبْها لَنَا    يــــا ذا الجلالِ وذا العلا والسؤْدَدِ
صَلّى الإلهُ وَمَنْ يَحُفُّ بِعَرْشِهِ    والطيبــونَ علــــى المبــاركِ أحمدِ

# تاقیکردنەوەی سێیەم

| پرسیار | ڕاست | هەڵە |
|---|---|---|
| • پێغەمبەری خوا (ﷺ) شوانی مەڕوماڵاتی کردووە ئەوەش هۆکارێك بوو بۆ ئارامگرتن و بەزەیی هاتنەوەی بە لاوازەکاندا و چاودێری کردنیان. | | |
| • کاتێك تەمەنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتە چل ساڵ ڕوناکی پێغەمبەرایەتی بەسەردا هەڵهات، و خوای گەورە لەڕۆژی هەینیدا بە پەیامەکەی ڕێزداری کرد. | | |
| • ئازاردانی قورەیش بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) زیادی کرد بۆیە خۆی و ئالو بەیتەکەیان سێ ساڵ لە شیوەکانی ئەبو تالیبدا گەمارۆ دا، کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە گەمارۆکە دەرچوو تەمەنی چل و نۆ ساڵ بوو. | | |
| • نێردراوە بە حەنیفییەی میهرەبانی و دژی دوو شت : شیرك و حەرام کردنی حەلاڵ. | | |
| • حەوت منداڵی هەبوو : چوار کوڕ و سێ کچ. | | |
| • هەموو منداڵەکانی لە خەدیجە بووە و لەهاوسەرەکانی تری منداڵی نەبووە. | | |
| • هەموو منداڵەکانی پێش خۆی کۆچی دواییان کردووە. | | |

خیلاف لەوەدا نییە کاتێك وەفاتی کرد ئەم نۆ خێزانەی لێ بە جێ ماوە : عائیشە، حەفصە، زەینەبی کچی جەحش، ئوم سەلەمە، صەفییە، ئوم حەبیبە، مەیمونە، سەودە، و جوەیریە.

خوای گەورە بە جبریلدا سەلامی بۆ خەدیجە ناردووە، و ئەمەش تایبەتە و نەزانراوە بۆ هیچ ئافرەتێکی تر بووبێت.

- پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مەککە لەدایك بووە لە : ☐ ساڵی فیل ☐ پێش کۆچ بە ٥٣ ساڵ ☐ هەردووکیان
- سەرەتای وەحیەکەی بە: ☐ خەڵوەتکردنی لا خۆشەویست کرا ☐ خەونی چاك ☐ هەردووکیان
- ژمارەی پلەکانی وەحی : ☐ پێنج ☐ حەوت ☐ سێ
- پلەکانی بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) : ☐ دوو ☐ سێ ☐ پێنج
- پاشان بەڕۆح و جەستە شەوڕەوی پێکرا بۆ مزگەوتی ئەقصا، پاشان بە بەرزکرایەوە بۆ سەرووی ئاسمانەکان بە(..............)بۆ لای خودا، خوداش قسەی لەگەڵ کرد و نوێژەکانی لەسەر فەرزکرد. : ☐ بە جەستە ☐ بە ڕۆح ☐ بە جەستە و بە ڕۆح.
- یەکەم مزگەوت لە ئیسلامدا بریتییە لە مزگەوتی : ☐ ئەلحەرام ☐ پێغەمبەر ☐ ئەقصا ☐ قوباء .
- گۆڕینی قیبلە ڕوویدا: ☐ لە مەککە پێش کۆچ ☐ لە ساڵی دووەمی کۆچی ☐ لە ساڵی سێیەمی کۆچی.
- غەزای بەدر لەڕەمەزاندا بوو لەساڵی : ☐ دووی کۆچی ☐ سێی کۆچی.

| یەکەم کەس باوەڕی هێنا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) | |
|---|---|
| لە پیاوان | ئەبو بەکری سدیق |
| لە منداڵان | عەلی کوڕی ئەبو تالیب |
| لە مەواڵیکان | زەیدی کوڕی حاریسە |
| لە کۆیلەکان | بیلالی کوڕی ڕەبباح |

| کەفالەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) : | |
|---|---|
| لە پاش مردنی دایکی کەفالەت کرا لە لایەن باپیری | عەبدولموتەلیب |
| ئەمجار باپیری وەفاتی کرد هێشتا تەمەنی پێغەمبەر | نزیکەی هەشت ساڵ |
| ئەمجار مامەی کەفالەتی کرد | ئەبو تالیب |
| باوکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی | عەبدوڵای کوڕی عەبدولموتەلیب |
| دایکی وەفاتی کرد هێشتا تەمەنی چەند ساڵی تەواو نەکردبوو | حەوت ساڵ |



| | |
|---|---|
| غەزا و نێردەکانی | |
| هەموو سریە و نێردەکانی لە پاش هیجرەت بوو لە ماوەی | دە ساڵ |
| سریە و نێردەکانی نزیکەی چەند | شەست |
| ژمارەی غەزاکانی چەند بوون | بیست و حەوت |
| جەنگا لە | لە نۆ دانەیدا |
| بریندار بوو لە | یەك غەزا |

# ئاوات ئەكادیمی

پێگەیەكی كاریگەر و سەركەوتوی بواری پەرەپێدانی تواناكانی مێشك و فێربوونە بە دروشمی:

زۆرترین فێربوون لە كەمترین كاتدا، كۆرس و پرۆگرامەكانی لە ڕێگای ئەپڵیكەیشن و سایتی ئاوات ئەكادیمی بڵاودەكاتەوە و هەمووان دەتوانن لە چانێڵی یوتیوب و تیلیگرام و پەیجەكانی فەیسبوك و ئینستاگرام و تیكتۆكی ئاوات ئەكادیمی سوودمەند ببن.

خولی چالاككردنەوەی مێشك و بەهێزكردنی یادگە چی تێدا دەخوێنرێت، چی بە دەست دەهێنرێت؟

پرۆگرامی چالاككردنەوەی مێشك و بەهێزكردنی یادگە پرۆگرامێكی ئۆنلاینی ١٠ هەفتەییە بۆ بەهێزكردن و بووژاندنەوەی خانەكانی مێشك و چارەسەری خاولەبەركردن و زوو لەبیرچوونەوەیە، لەو ماوەیەدا بەشداربوو دەگاتە ئاستێكی زۆر جیاواز و تایبەت كە خۆی خەونی پێوە دەبینی، هەر بەو جۆرەی لە سەدان نامەی دەنگی و نووسین و ڤیدیۆییدا بەشداربووان باسی خۆیان كردووە.

## وانەكان بە دوو شێواز پێشكەش دەكرێن:

١- ئۆنلاینی ڕاستەوخۆ: وانەكان لە بەرنامەی زووم دەخوێنرێن، بەشداربوو هیچ وانەیەكی لە كیس ناچێت، هەر وانەیەكیشی بە هۆی ئێمەوە لە دەست چوو، بۆی قەرەبوو دەكرێتەوە، هەفتانە سێ وانەی ڕاستەوخۆیە، هەر وانەیەك دوو سەعاتە.

٢- وانەی تۆماركراو: لە ئەپی ئاوات ئەكادیمی بۆ بەشداربووان چالاك دەكرێت و هەفتانە تاقیكردنەوەی تێدا دەكەن، هەروەها بۆ ڕاهێنان و چالاكی و وەڵامدانەوەی پرسیارەكانیان گرووپی تایبەت بە بەشداربووان دادەنرێت.

لەم خولەدا بە شێوەیەكی بەرنامەبۆدارێژراو سیستەمی سەرەكی دەخوێنرێت.

## سیستەمی سەرەكی ئەم سوودانەی هەیە:

- بێ ئەندازە توانای تەركیزكردن پەرە پێ دەدات و بیربڵاویت كەم دەكاتەوە.
- چەند هێندە سەرنجدان بەهێز دەكات، و وێناكردنی یادگەیی زۆر باش دەكات.
- پەیوەندیی لای ڕاست و چەپی مێشك پتەو دەكات.

- مێشک دیجیتاڵی دەکات، دەتوانیت هەموو زانیارییەک بە ژمارەوە لە بەر بکەیت.
- ئاستی دیققەت و وردی بەرێژەیەکی زۆر بەرز دەکاتەوە.
- توانای لەبەرکردن زۆر خێرا و بەهێز دەکات، مێشک چالاک دەکاتەوە.
- پەیوەندیی خانەدەماری درووست دەکات و خێرای دەکات.
- توانای داهێنان و بەرهەمهێنانی بیرۆکەی نوێ زیاد دەکات.
- ئاستی زیرەکی بەرەو پێش دەبات، بەو شێوەیەی لای ئێمە دەیخوێنیت، چەندان سوود تریشی هەیە.

**تێبینی:** سیستمی سەرەکی بۆ کوردزمانان تەنیا لە ئاوات ئەکادیمی بەردەستە، لەم خولەدا خولی پێشکەوتووی بەهێزکردنی تەرکیز و یادگە دەخوێنرێت، وانەکان بەسەر ١٠ هەفتەدا دابەشکراون، بە شێوەیەکی ورد دارشتنەوەی بۆ کراوە و هەفتانە لێپرسینەوەی لەگەڵدایە، هەر کێشەیەکت هەبێت، بە ڕاوێژی تایبەت مامۆستا و هاوکارانی خول لەگەڵت دەبن بۆ چارەسەرکردنی، ماوەکەی ١٨ سەعاتی تۆمارکراوە، هەموو تەکنیک و بنچینەکان و ناسینی یادگەی تێدایە و خۆی بۆ خۆی خولێکی تەواوە، ئەم خولە جیاواز لە زۆرێک لە خولەکانی تر خولێکی کردارییە و بە ڕاهێنانەوە پێشکەش دەکرێت، بە شێوەیەک تۆ لە هەفتەیەکدا سێ جار بە ڕاستەوخۆ دێیتە سەر هێڵ و لە ماڵەکەی خۆت یان لەسەر کارەکەت لەگەڵمان ڕاهێنان دەکەیت.

هەروەها بابەتی تایبەت دەخوێنیت و ئاستەکان تێ دەپەڕێنیت خولەکە بۆ ٧ ئاست و تێپەڕاندنی بەربەستەکانی لەبەرکردن دابەش کراوە، لە کەشێکی پڕ وزە و ژینگەیەکی پڕ لە هەوڵدان و پێشبڕکێدا بە ڕاستەوخۆ بەربەستەکان دەبڕیت، تاوەکو دەگەیت بە لەبەرکردنی لاپەڕەیەک لە ماوەی چەند خولەکێکی زۆر کەم لە چاو توانای ئێستاتدا، ئیتر تۆ هەموو هەفتەیەک دەزانیت لەچ ئاستێکی زیهنی و یادگەییدایت، گرنگیی تەواو بە ڕاهێنانەکانی چالاککردنەوە و گەرمکردنی مێشک دەدرێت، و ڕاهێنان و تەکنیکی "خێرا بینین" دەخوێنیت.

**سوودەکانی خێرابینین:** مێشک و چاو بۆ شیکار و چارەسەر خێرا دەکاتەوە.

- مێشک چالاک دەکاتەوە و خێرای دەکاتەوە، و لە وڕی و سستی و خاوی ڕزگاری دەکات.
- تەرکیزت بەهێز دەکات و پەیوەندیی دەمارەخانەکان خێرا دەکات.
- خەواڵوویی ناهێڵێت و بۆ لەبەرکردن وریا دەبیتەوە.
- بینایی چاوت زۆر دەکات و دەتوانیت زۆرترین شت ببینیت.
- خێرایی خوێندنەوەت زیاد دەکات.

لەگەڵ کۆمەڵێک سوودی تردا ڕاهێنانەکانی "خێرابیستن" دەخوێنرێت کە بۆ ئەوە گرنگە تا یادگەی بیستنیت خێرا ببێتەوە و پێش بکەویت و زۆرترین شت لەڕێی بیستنەوە لە بەر بکەیت.

**سوودەکانی ڕاهێنانی خێرابیستن:**

- توانای مێشک و یادگەی بیستنی بۆ چارەسەری کێشەکان خێرا دەکاتەوە.
- خەیاڵ ڕۆشتنت لە کاتی گوێگرتندا ناهێڵێت و، هەمیشە وریا و چوست و چالاک دەبیت.
- تەرکیزت بەهێز دەکات و پەیوەندیی دەمارەخانەکان خێرا دەکاتەوە.
- یادگەی بیستنیت دەبووژێنێتەوە کە لە قوتابخانە و مەنهەجی زانکۆ و سەنتەرەکان بە هۆی بەکارنەهێنانیەوە لاوازیان کردووە، لەم خولەدا ترس و دوودڵیی تاقکردنەوەت نامێنێت.

هەمیشە کەسێکی بەبەرنامە و بەپلان و ئامانجدار دەبیت، لەم خولەدا گرنگییەکی باش بە ساغیی مێشک و دەروون و جەستە دەدرێت، کۆمەڵێک شت دەبیستیت ڕەنگە بە هەموو تەمەنت ئەو گەنجینانەت دەست نەکەونەوە.

توانای مێشک و یادگەت بۆ ١٥ هێندە و زیاتریش زیاد دەکات (پشت بەخوای گەورە)، بەو مەرجەی ئەوەی ئێمە دەیڵێین جێبەجێی بکەیت.

www.awatacademy.com

# پێرستی بابەتەکان



# پوختەیەکی بەسوود

## لەسەر ژیاننامەی پێغەمبەری خودا ﷺ

## ڕەوشت و ئاکارەکانی

2023